شکۆمەندیی، ئەی خوایە! بەرەکەت و پێز بۆ سەر موحەممەد بنێرەو، بۆ سەر شوێنکەوتووانی موحەممەدو نیزیکانی موحەممەد، هەروەک چۆن بەرەکەت و پێزت بۆ سەر شوێنکەوتووانی ئیبراهیم ناردوە، بە دڵنیایی تۆ ستایشکراوی شکۆداری».

## پێغەمبەر ﷺ ڕەوشتە جوانەکانی تەواو کرد

٦٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صَالِحَ الْأَخْلَاقِ»[١].
ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من تەنها بۆ ئەوە نێردراوم، ڕەوشتە جوان و چاکەکان تەواو بکەم.

## ڕووخۆشی بەرانبەر خەڵک

٦٦٩- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ»[٢].
ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەردەخەنەو ڕووخۆشیت بۆ براکەت بە چاکە بۆت هەژمار دەکرێ.

## هەر قسەیەکت بیست مەیگێڕەوە

٦٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كَفَى بِالْمَرءِ إِثْماً أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعْ»[٣].
ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ کە پێی گوناهبار بێ، کە هەرچی بیستوویەتی بیگێڕێتەوە.

---

(١) أخرجه أحمد: ٨٩٣٩، قال شُعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٨٩١، وابن حبان: ٥٢٩، قال شُعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

(٣) أخرجه ابن حبان: ٣٠، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الصحيح.

## قسەت خۆش بێ

٦٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قسەیەکی خۆش چاکەیەکە.

## مامەڵەت خۆش بێ

٦٧٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ»[2].

ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: لە هەر شوێنێک بوویت پارێز لە خوا بکە، هەر خراپەیەکیشت کرد چاکەیەکی بە دوادا ئەنجام بدە، خراپەکەت دەسڕێتەوە، وە بە ڕەوشتی جوان هەڵسوکەوت و مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکە.

## تەرازووی چاکەکانت قورس بکە

٦٧٣- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ شَيْءٌ أَثْقَلَ فِي الْمِيزَانِ مِنْ خُلُقٍ حَسَنٍ»[3].

ئەبو دەڕداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: هیچ شتێک نییە لە تەرازووی (کردەوە چاکەکاندا) قورستر بێ لە ڕەوشتی جوان.

---

(١) أخرجه البُخَاري: ٢٨٢٧، معلقا، وأحمد: ٨١٦٨ ، تعليق شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) أخرجه الترمذي: ١٩٨٧، وقال: حسن صحيح، وحَسَّنَهُ الألباني.

(٣) أخرجه أحمد: تعليق شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

## سوپاسگوزار به

٦٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ ﷻ»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سوپاسی خەڵک نەکات، (کە چاکەیان لەگەڵ کردوە) ئەوە سوپاسی خوای گەورەی نەکردوە.

## سادەو خاکی به

٦٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ»[2].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لەبەر خوا بێ فیزو خاکی بێ، بە دڵنیایی خوا بەرزی دەکاتەوە.

## یارمەتیدەر به

٦٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ»[3].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا لە یارمەتیدانی بەندە دایە، ئەوەندەی بەندە لە یارمەتیدانی برا (و خوشکە)کەی دابێ.

---

(١) أخرجه أحمد: ١١٢٩٨، تعليق شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الصحيح، والترمذي: ١٩٥٥، وقال: حسن صحيح.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٥٨٨.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٦٩٩.

## ڕاستگۆ بە

**٦٧٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ: يِهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقاً، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ: يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّاباً»[(١)].**

عەبدوڵلا(ی کوڕی مەسعوود) ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: داواتان لێدەکەم دەست بە ڕاستگۆییەوە بگرن، بێگومان ڕاستگۆیی ڕێنماییە بۆ (هەموو کردارو گوفتارێکی) چاکە، وە چاکەش ڕێنماییە بۆ بەهەشت! وە پیاوی وا هەیە هێندە ڕاستگۆیەو عەوداڵی ڕاستییە هەتا لەلای خوا ناوی بە ڕاستگۆ دەنووسرێ، وە داواتان لێدەکەم خۆتان بپارێزن لە درۆکردن، چونکە بێگومان درۆکردن ڕێنماییە بۆ خراپەکاری و لادان لە ڕێی ڕاست، وە خراپەکاریش ڕێنماییە بۆ ئاگر، وە پیاوی وا هەیە هێندە درۆ دەکات و عەوداڵی درۆیە هەتا لەلای خوا ناوی بە درۆزن دەنووسرێ.

## ئاسانکار بە لە ژین و دین

**٦٧٨- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا بَعَثَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ قَالَ: «بَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا، وَيَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا»[(٢)].**

واتە: ئەبوو موسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک یەکێک لە هاوەڵانی دەنارد بۆ هەندێ لە کاروبارەکانی دەیفەرموو: موژدەدەربن (بۆ خەڵکی)و دووریان مەخەنەوە (لە دین)، وە ئاسان کاربن، سەختگیری و قورسی مەکەن (لە دیندا).

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٧٤٣، ومسلم: ٦٨٠٥، واللَّفْظُ لَهُ.

(٢) أخرجه البخاري: ٦٩، ومسلم: ٦٩.

## خاوەن شەرم و شکۆ بە

٦٧٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ»(١).

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەرم و حەیا لە هەر شتێکدا هەبێ جوانی دەکات، بێشەرمی و بێڕێزی لە هەر شتێکدا هەبێ حەتمەن ناشرینی دەکات.

## ئاسانکارو نەرم و نیان بە

٦٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ سَهْلاً هَيْنَاً لَيْناً حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ»٢.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕەوشت و ئاکاری ئاسان بێت و، لەسەرخۆو، نەرم و نیان بێ، خوا ئاگری دۆزەخی لەسەر قەدەغە دەکات.

## خەڵات خۆشەویستی زیاد دەکات

٦٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: «تَهَادُوا تَحَابُّوا»(٣).

ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: دیاری و خەڵات بدەن بە یەکتر، خۆشەویست دەبن لە لای یەکتری.

---

(١) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٦٠١، وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الأدب المفرد.

(٢) أخرجه الحَاكِمُ: ٤٣٥، وقال: صَحِيح عَلَىَ شَرَطِ مسلم، والبيهقي في الكبرى: ٢٠٥٩٥.

(٣) أخرجه البخاري فـي الأدب المفرد: ٥٩٤، وأبو يعلى: ٦١٤٨، والبيهقي في الكبرى: ١١٧٢٦، وَحَسَّنَهُ الألباني.

## هەر کارێکت کرد بە جوانی بیکە

٦٨٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قال: النَّبِيَّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ»[1].

عائیشە ﵂، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا پێی خۆشە ئەگەر یەکێکتان کارێکی کرد، بە وردەکاریی و پوختی و ڕێکی ئەنجامی بدات.

## کە چووی بۆ شوێنێک سڵاو بکە

٦٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : «لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ»[2].

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناچنە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن، وە تا یەکتریشتان خۆشنەوێ ئیمانتان تەواو نابێ! جا ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر ئەنجامی بدەن بە هۆیەوە یەکترتان خۆشدەوێ؟ لە نێو خۆتان سڵاو بڵاو بکەنەوە.

## چاک و چۆنی و تەوقە بکە

٦٨٤- عَنِ الْبَرَاءِ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ، فَيَتَصَافَحَانِ إِلَّا غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا»[3].

بەڕڕاء ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر دوو مسوڵمانێک بە یەکدی بگەن و تەوقە بکەن، ئەوە بە مسۆگەری و دڵنیایی پێش ئەوەی لە یەکدی جیاببنەوە (خوا) لە گوناهی هەردووکیان خۆش دەبێ.

---

(١) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٥٣١٢، وأبو يعلى: ٤٣٨٦، والطبراني في الأوسط: ٨٩٧، قال الألباني: (صحيح) وللحديث شاهد يقويه بعض القوة وهو بلفظ: إن الله يحب من العامل إذا عمل أن يحسن. انظر: السلسلة الصحيحة: ١١١٣.

(٢) أخرجه مسلم: ٥٤.

(٣) أخرجه أبُو داود: ٥٢١٢، وصَحَّحَهُ الألباني.

## که یەکێک لە مەجلیس هەڵسا، مەچۆ بۆ شوێنەکەی

٦٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ»(١).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لە شوێنی دانیشتنی خۆی هەڵسا (لە کۆڕو مەجلیس)، دوایی هاتەوە بۆ ئەو شوێنە، ئەوە خۆی بەو شوێنە شایستەترە.

## مۆڵەت وەردەگرین بۆ چوونە ماڵان

٦٨٦- عَنْ سَهْلِ بْنَ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ»(٢).

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان مۆڵەت وەرگرتن لەبەر بینین دانراوە (تاوەکو خەڵکی یەکتر بە شێوازی ناشایستە نەبینن).

## لە نێوان دوو کەس دامەنیشە بێ مۆڵەت وەرگرتن

٦٨٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ، إِلَّا بِإِذْنِهِمَا»(٣).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دروست نییە بۆ کەسێک کە دوو کەسان لێک بکاتەوە لە کاتی دانیشتن (بچێ لە نێوانیان دابنیشێ)، مەگەر بە مۆڵەتی هەردووکیان (ئەم کارە بکات).

---

(١) أخرجه أحمد: ٧٧٩٧، تعليق شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٨٨٧، ومسلم: ٢١٥٦.

(٣) أخرجه أحمد: ٦٩٩٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، وأبو داود: ٤٨٤٥، والترمذي: ٢٧٥٢، وقال: حسن صحيح.

## ئەگەر سێ کەس بوون، با دوو کەس پێکەوە چپە نەکەن

٦٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ صَاحِبِهِمَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ»[1].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ کەس بوون، با دوانیان جیا لەوەی دیکە چپەچپ نەکەن چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی خەفەتی پێ بخوات، وە گومانی لە دڵدا دروست بێ کە ڕەنگە باسی ئەو بکەن.

## هاوڕێی باش هەڵبژێرە

٦٨٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ»[2].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤ لەسەر ئایینی هاوڕێکەیەتی، بۆیە هەر یەکێک لە ئێوە با سەیر بکات، بزانێ کێ دەکاتە خۆشەویست و هاوڕێی خۆی؟

## هەموو کەسێک هەڵە دەکات

٦٩٠- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ»[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٩٣٢، ومسلم: ٢١٨٤.

(٢) أخرجه أبو داود: ٤٨٣٣، والترمذي: ٢٣٧٨، وقال: حسن غريب، وعبد بن حميد: ١٤٣١.

(٣) أخرجه أحمد: ١٣٠٧٢، وعبد بن حميد: ١١٩٧، والترمذي: ٢٤٩٩، وابن ماجه: ٤٢٥١، والحاكم: ٧٦١٧، وقال: صحيح الإسناد.

ئەنەس ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو بەنی ئادەم (هەرچی مرۆڤە) هەڵەکارن و هەڵە دەکەن، وە باشترینی هەڵەکاران ئەوانەن کە پێداچوونەوە بۆ خۆیان دەکەن و زۆرو زوو تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە.

## دوای خواردن و خواردنەوە سوپاسی خوا دەکەین

٦٩١- عَنْ أَنَسٍ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا»(١).

ئەنەس ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا بەوە لە بەندەکەی ڕازی دەبێ، کە خواردنێک بخوات و ستایشی بکات لەسەری، وە خواردنەوەیەک بخواتەوەو ستایشی بکات لەسەری.

## هەموومان پێکەوە خواردن دەخۆین

٦٩٢- عَنْ وَحْشِيِّ بْنِ حَرْبٍ ﷛ أَنَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَأْكُلُ وَلاَ نَشْبَعُ؟! قَالَ: «فَلَعَلَّكُمْ تَفْتَرِقُونَ»؟ قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: «فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ»(٢).

وەحشی کوڕی حەرب ﷛ دەگێڕێتەوە کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا هەر خواردن دەخۆین و تێر نابین؟! (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: لەوانەیە لە جیا بیخۆن؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: جا (لەمەودوا) لەسەر (سفرەی) خواردنەکانتان کۆببنەوە، وە ناوی خوای لەسەر بێنن، بەرەکەت و پیزی تێدەکەوێ.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٧٣٤.

(٢) أخرجه أحمد: ١٦١٢٢، وأبو داود: ٣٧٦٤، وابن ماجه: ٣٢٨٦، وابن حبان: ٥٢٢٤، قال شُعيب الأرنؤوط: حسن بشواهده، قال العجلوني (٤٨/١): سنده حسن.

## نیاز و مەبەستەکان کلیلی کردەوەکانن

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ١١﴾ الزمر. واتە: بڵێ: من فەرمانم پێکراوە، بەندایەتی بۆ خوا بکەم بەدڵسۆزیەوە بۆی ملکەچ بم.

٦٩٣- عن عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[١].

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەسەر مینبەر گوتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ، دەیفەرموو: بێگومان (قبووڵ بوونی) کردەوەکان بە پێی نیازەکانە، وە هەموو کەسێک بە پێی نیازەکەی پاداشت دەدرێتەوە، جا هەر کەس کۆچ کردنی بۆ بەدەستهێنانی (دەستکەوتێکی) دونیایی بێ، یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێک بێ، ئەوە کۆچ کردنەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردوە. (مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە کە نیازو مەبەست بنچینەو بنەمای هەموو کارێکە).

## چەند نموونەیەک دەربارەی بەشەکانی ئیمان
## ئەوانەی پەیوەستن بە دڵ و وتە و کردەوەکان

٦٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الإِيْمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ، أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ، شُعْبَةً، فأَفْضَلُهَا قَوْلُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»[٢].

---

(١) أخرجه البخاري: ١، ومسلم: ١٩٠٧.

(٢) أخرجه مسلم: ١٥١.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیمان حەفتاو ئەوەندە، یان شەست و ئەوەندە بەشەیە، باشترینیان (گوتنی وشەی:) هیچ پەرستراوێک نییە (بە هەق) جگە لە خوا، وە کەمترینی لابردنی هەر شتێکە لە ڕێگەی خەڵک، کە ئەزیەتیان بدات، وە حەیا بەشێکە لە ئیمان.

## حەزکردن بە چاکەی خەڵک لە بەشەکانی ئیمانە

٦٩٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»[١].

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نییە، تاکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ برا (و خوشکی مسوڵمانیشی) پێ خۆش نەبێ.

## خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ لە تەواوی ئیمانە

٦٩٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ، وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»[٢].

ئەنەس ﷺ، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نییە، هەتا منی لە باوک و دایک و منداڵەکانی و هەموو خەڵک خۆشتر نەوێ.

## خۆشویستنی هاوەڵان لە بەشەکانی ئیمانە

٦٩٧- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «آيَةُ الإِيْمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الأَنْصَارِ»[٣].

---

(١) أخرجه البخاري: ١٣، واللفظ له، ومسلم: ١٦٨.

(٢) أخرجه البخاري: ١٥، واللفظ له، ومسلم: ١٦٦.

(٣) أخرجه البخاري: ١٧، واللفظ له، ومسلم: ٢٣٢.

ئەنەس ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویستی ئەنصار نیشانەی ئیمانە، ڕق لێبوونەوەی ئەنصار نیشانەی دووڕوویيە.

## فراوانی بەزەیی خواو جیاوازی پلەکانی ئیمان

٦٩٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷛ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدِ اسْوَدُّوا، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهر الْحَيَا، أَوِ الْحَيَاةِ، شَكَّ مَالِكٌ، فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ، أَلَمْ تَرَ أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً»[1].

ئەبو سەعیدی خودریی ﷛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەهەشتییەکان دەچنە بەهەشت، دۆزەخییەکانیش دەچنە دۆزەخ، پاشان خوای زاڵی پایەدار پێیان دەفەرموێ: هەر کەسێک بە ئەندازەی تۆزقاڵێک لە خەردەل ئیمانی لە دڵ دا هەیە دەریانبێنن، کە دەردەهێنرێن ڕەش هەڵگەڕاون، دەخرێنە نێو ڕووباری ژیان، دەڕوێنەوە هەروەک چۆن دەنکە تۆوێک لە تەنیشت ئاوێکدا دەڕوێت، ئایا نەتبینیوە ئەم دەنکە چۆن چەکەرە دەکات بە ڕەنگی زەردەوە ملی خوار کردۆتەوە.

## ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان لە بەشەکانی ئیمانە

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر فەرز کراوە، وەک چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوەش فەرز کرابوو، بەڵکو پارێز بکەن.

٦٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[2].

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٢، واللفظ له، ومسلم: ٤٥٦.

(٢) أخرجه البخاري: ٣٨ واللفظ له، ومسلم: ١٧٥.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ و، بڕوای پێی هەبێ و، چاوەڕوانی پاداشت بێ، خوا لە گوناهەکانی پێشووی دەبورێ.

## چاکە کردن لەگەڵ دراوسێ و ڕێزگرتن لە میوان و نەگوتنی قسەی خراپ لە بەشەکانی ئیمانە

٧٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با دراوسێکەی ئەزیەت نەدات، هەرکەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێ، وە هەر کەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاک بکات، یان بێ دەنگ بێ.

## ئازاردانی دراوسێ لە ناتەواوی ئیمانە

٧٠١- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، قِيلَ: وَمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الَّذِي لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَايِقَهُ»[٢].

ئەبو شورەیح ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە خوا ئیمان ناهێنێ، بە خوا ئیمان ناهێنێ، بە خوا ئیمان ناهێنێ، گوترا: کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە دراوسێیەکەی لە زیان و زەرەری دڵنیا نییە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٠١٨، ومسلم: ١٧٢.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٦٧٠.

## ئاسانکاری لەسەر خەڵک لە ئایینەکەیان و خۆدوورگرتن لە توندی

**٧٠٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلاَّ غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا، وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنَ الدُّلْجَةِ»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئایین ئاسانە، هەرکەسێک لەسەری قورس بکات، ئەوە دین بەسەریدا زاڵ دەبێ، دەست بەوە بگرن، کە ڕاستە (بەبێ زێدەڕۆیی)، نزیک ببنەوە، مژدە بدەن، ئاسانکاربن، بە بەیانیان و ئێواران پەرستش ئەنجام بدەن، وە بەشێکی نیوەی شەویش.

ڕووداوی ئەم فەرموودە:

یەکێک لە هاوەڵان داوای کرد لە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێبدات هەموو ڕۆژێک ڕۆژوو بگرێ، لەو کاتە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەم فەرموودەی پێ فەرموو، ئنجا کە ئەم هاوەڵە بەتەمەندا چوو، بینی وەک جاران توانای نییە ڕۆژووەکان بگرێ، کە لە سێ ڕۆژان ڕۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو.

## پاک و خاوێنی و دەستنوێژ

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة، واتە: بێگومان خوا تەوبەکارانی خۆشدەوێ و، خۆپاککەرەوانی خۆشدەوێ.

**٧٠٣-** عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْحَارِثِ بْنِ عَاصِمٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ -أَوْ: تَمْلَأُ- مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَك أَوْ عَلَيْك، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا»[2].

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٩ .

(٢) أخرجه مسلم: ٢٢٣. والترمذي: ٣٥١٧، وقال: حديث صحيح.

ئەبو مالیكی ئەشعەریی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاك و خاوێنی بەشێكی ئیمانە، (الْحَمْدُ للهِ) تەرازوو پڕ دەكات، (وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ) نێوانی ئاسمانەكان و زەوی پڕ دەكەن، نوێژ ڕووناكییە، خێرو چاكەكردن بەڵگەی (ملكەچییە بۆ خوا)، ئارامگرتن ڕووناكییە، قورئانیش بەڵگەیە بۆت، یان لەسەرت، خەڵكی هەموو بەیانیان زوو دەڕۆن خۆیان دەفرۆشن و خۆیان ڕزگار دەكەن (بەگوێڕایەڵی خوای گەورە)، یاخود خۆیان لە نێو دەبەن (بە سەرپێچی خوای گەورە).

٧٠٤- عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ»[1].

عەبدولعەزیزی كوڕی صوهەیب، دەڵێ: گوێم لە ئەنەس ﷺ بوو دەیگوت: هەر كاتێك پێغەمبەر ﷺ بیویستایە بچێتە سەرئاو دەیفەرموو: خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە جنۆكەی نێرو مێ.

## دەستپێكردن بە لای ڕاست لە دەستنوێژ و هەركارێكی دی سوننەتە

٧٠٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ، وَتَرَجُّلِهِ، وَطُهُورِهِ، وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ»[2].

(دایكی بڕواداران) عائیشە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆری پێخۆش بوو بە لای ڕاستی دەست پێبكات كە نەعلی لەپێ دەكرد، كە قژی دادەهێنا، كە دەستنوێژی دەگرت، یان كە خۆی دەشۆرد، وە لە هەموو كاروبارێكیدا.

---

(١) أخرجه البخاري: ١٤٣، ومسلم: ٣٧٥.

(٢) أخرجه البخاري: ١٦٨.

## شۆردنی ئەندامەکان لە دەستنوێژدا دروستە جارێک، یان دووجار، یان سێ جار بێ

٧٠٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ «مَرَّةً مَرَّةً»(١).

ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ، دەستنوێژی گرت یەکجار یەکجار.

## چۆنێتی دەست نوێژ گرتن بە تێرو تەسەلی

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ ... ﴿٦﴾﴾ المائدة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات بۆ نوێژ هەڵسان، ڕووتان بشۆن، وە هەردوو دەستیشتان هەتا ئانیشکان، وە دەستی تەڕ بەسەرتاندا بێنن، وە لاقەکانیشتان بشۆرن هەتا دوو گوێزینگەکان.

٧٠٧- عَنْ حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ دَعَا بِإِنَاءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الْإِنَاءِ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلَاثَ مِرَارٍ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»(٢).

حومڕان خزمەتکاری عوسمان ﵁ دەگێڕێتەوە، کە ئەو عوسمانی کوڕی عەففانی بینی، داوای قاپێکی کرد، سێ جار بە قاپەکە ئاوی بە دەستیدا کرد و شۆردی، پاشان دەستی ڕاستی خستە نێو قاپەکەو شۆردی، ئاوی لە دەم و لووتی وەردا، پاشان سێ جار ڕوخساری شۆرد، پاشان سێ جار دەستی شۆرد تا ئەنیشکەکانی،

---

(١) أخرجه البخاري: ١٥٨.

(٢) أخرجه البخاري: ١٥٩.

پاشان مەسحی سەری کرد، دوایی سێ جار قاچی تا گوێزینگی شۆرد، ئنجا گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک دەستنوێژ بگرێ وەک ئەم دەستنوێژەی من، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات، خۆی سەرقاڵ نەکات بە شتی دیکە تێیدا، ئەوە خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ.

## دەستنوێژ گرتن مەرجێکە لە مەرجەکانی نوێژ

٧٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقْبَلُ اللّهُ صَلاةَ أَحَدِكُمْ إِذَا أَحْدَثَ، حَتَّى يَتَوَضَّأَ»(١).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا نوێژی هیچ یەکێکتان وەرناگرێ، ئەگەر دەستنوێژی نەما، تاکو دەستنوێژ دەگرێتەوە.

## ئەو شتانەی دەستنوێژ دەشکێنن

٧٠٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، الرَّجُلُ الَّذِي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلاَةِ، فَقَالَ: «لاَ يَنْفَتِلْ أَوْ لاَ يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً أَوْ يَجِدَ رِيْحاً»(٢).

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاوێک کە هەست بە شتێک بکات لە نێو نوێژەکەیدا (وەک ئەوەی دەستنوێژی شکاوە)، فەرمووی: با نوێژەکەی نەبڕێ تا دەنگێک دەبیستێ، یان بۆنی بایەک دەکات.

٧١٠- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَأَمَرْتُ اَلْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ أَنْ يَسْأَلَ اَلنَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ؟ فَقَالَ: «فِيهِ اَلْوُضُوءُ»(٣).

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٩٥٤.

(٢) أخرجه البخاري: ١٣٧.

(٣) أخرجه البخاري: ١٣٢.

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: من پیاوێک بووم مەزیم زۆر بوو، بە میقدادی کوڕی ئەسوەدم گوت: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەویش پرسیاری لێکرد (ئەگەر کەسێک وابێ؟)، فەرمووی: پێویستە دەستنوێژ بگرێتەوە.

## میزی ئەو منداڵەی کە خواردن ناخوات پێویست ناکات شوێن میزەکە بشۆردرێ بەڵکو ئاوپرژێن دەکرێ

٧١١- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ الأَسَدِيَّةِ ﷺ: أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ، لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ، إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَجْلَسَهُ فِي حَجْرِهِ، فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ، فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ[١].

دایکی قەیسی کچی میحصەنی ئەسەدیيە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو منداڵێکی شیرەخۆری هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی نەدەخوارد، (پێغەمبەر ﷺ) لە باوەشی خۆیدا دایینیشاند، منداڵەکەش میزی بە کۆش (باوەش)ی دا کرد، (پێغەمبەر ﷺ) داوای کرد ئاوی بۆ بێنن، ئاوەکەی پرژاند بەسەر پۆشاکەکەی و، نەیشۆری.

## پاککردنەوەی ددانەکان یەکێکە لە سوننەتەکانی پێشنوێژ

٧١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي أَوْ عَلَى النَّاسِ، لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلَاةٍ»[٢].

ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قورس نەبووایە لەسەر ئۆممەتەکەم، یان لەسەر خەڵک، فەرمانم پێدەکردن لەگەڵ هەموو نوێژێک سیواک بکەن.

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٢٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٨٨٧.

## یەکێک لە مەرجەکانی مەسح کردن لەسەر خوفەکان دەستنوێژ گرتنە پێش لە پێ کردنیان

٧١٣- عَنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَهْوَيْتُ لِأَنزِعَ خُفَّيهِ، فَقَالَ: «دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدخَلتُهُمَا طَاهِرَتَينِ فَمَسَحَ عَلَيهِمَا»[١].

موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم لە سەفەرێکدا، خۆم شۆڕ کردەوە تا خوفەکانی لەپێ بکەمەوە (تا پێیەکانی بشوات)، فەرمووی: وازیان لێ بێنە، بە دەستنوێژەوە لە پێم کردوون، ئنجا مەسحی لەسەر هەردووکیان کرد.

## فەزڵی نوێژی بە کۆمەڵ

٧١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ أَفضَلُ مِنْ صَلاَةِ الفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[٢].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی بە کۆمەڵ بیست و حەوت پلە چاکترە لە نوێژی بە تەنیا.

## ماوەی مەسح کردن لەسەر خوفەکان لە سەفەرو نیشتەجێ بوون

٧١٥- عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِيءٍ ﷺ قَالَ أَتَيْتُ عَائِشَةَ أَسْأَلُهَا عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَتْ: عَلَيْكَ بِابْنِ أَبِي طَالِبٍ فَسَلْهُ، فَإِنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ، وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ[٣].

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٠٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٦٤٥.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٧٦.

شورەیحی کوڕی هانیئ دەڵێ: چووم بۆ لای عائیشە بۆ پرسیار کردن دەربارەی مەسح کردن لەسەر خوفەکان، گوتی: بڕۆ بۆ لای عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب پرسیاری لێ بکە، چونکە ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتی دەکرد، ئێمەش پرسیارمان لێکرد دەربارەی مەسح کردن، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە، ئەوەی گەشتیارە سێ ڕۆژو شەوەکانیشی (مەسح بکات)، ئەوەشی دانیشتووە (واتە: لە سەفەر نییە) شەوو ڕۆژێک مەسح بکات.

## سوننەتەکانی فیطرەت

٧١٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «عَشْرَةٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَقَصُّ الْأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَالإِسْتِنْشَاقُ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ»، قَالَ مُصْعَبٌ: «أحد الرواة السند» وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ[١].

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دە شت هەن لە سروشتی مرۆڤن: سمێڵ کورتکردنەوە، کورتکردنەوەی نینۆکەکان، شۆردنی ئەو شوێنانەی کە پیسی تێدا کۆدەبنەوە، ڕیش هێشتنەوە، بەکارهێنانی سیواک، ئاو لە لووت وەردان، هەڵکەندنی مووی بنباڵ، لابردنی مووی پێش و پاش، خۆپاککردنەوە دوای سەرئاو کردن، موصعەب (کە یەکێکە لە زنجیرەی ڕاویەکان دەڵێ): دەیەمم بیرچوو، وادەزانم ئاو لە دەم وەردانە.

## فەزڵ و چاکەی نوێژی بەیانی

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴿٧٨﴾ ﴾ الإسراء، واتە: لە کاتی لادانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمانەوە، تاکو تاریکایی شەو، نوێژ بەرپا بکە و، قورئان خوێندنی (نوێژی)

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٦١ والنسائي في سننه: ٥٠٤٠، واللَّفْظُ لَهُ.

بەیانیش گرنگی پێ بدە، بە دڵنیایی قورئان خوێندنی بەیانی بینراوو لەلا ئامادە بووە (واتە: فریشتەکان ئامادەی دەبن).

٧١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبيِّ ﷺ قَالَ: «تَجْتَمِعُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ»، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ۝٧٨﴾ الإسراء[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکانی شەوو فریشتەکانی ڕۆژ لە کاتی نوێژی بەیانی کۆدەبنەوە، پاشان ئەبو هورەیرە گوتی: (ئەوە) بخوێننەوە ئەگەر دەتانەوێ: ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ۝٧٨﴾ الإسراء.

## کۆتا کاتی هەردوو نوێژی بەیانی و عەسر

٧١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً قَبْلِ أَنْ تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَ اَلصُّبْحَ، وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ اَلْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ اَلشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَ اَلْعَصْرَ»[2].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ڕکاتێک بگات لە نوێژی بەیانی پێش ئەوەی خۆر هەڵهاتبێ ئەوە بە نوێژی بەیانی گەیشتووە، وە هەرکەسێک بە ڕکاتێک بگات لە نوێژی عەسر پێش خۆرئاوابوون، ئەوە بە نوێژی عەسر گەیشتووە.

## ئەو کاتانەی نوێژ کردن تێیاندا باش نییە

٧١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلاَتَيْنِ: «بَعْدَ الفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ العَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ»[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٤٨.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٧٩.

(٣) أخرجه البخاري: ٥٨٨.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە نوێژ کردن لە دوو کات: لە دوای نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵدێ، وە لە دوای نوێژی عەسر هەتا خۆرئاوا دەبێ.

## مسوڵمان زیندوو بێ، یان مردوو، پاکە

٧٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ لَقِيَهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ، وَهُوَ جُنُبٌ فَانْسَلَّ فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ، فَتَفَقَّدَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَلَمَّا جَاءَهُ، قَالَ: «أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ»؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقِيتَنِي وَأَنَا جُنُبٌ فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ حَتَّى أَغْتَسِلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّ الْمُؤْمِنَ لاَ يَنْجُسُ»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشتووە لە ڕێگایەک لە ڕێگاکانی مەدینە، لەو کاتەدا لەشی گران بوو، خۆی لێ شاردەوە، چوو خۆی شۆرد، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پرسی، کاتێک گەڕایەوە بۆ لای گوتی: لە کوێ بووی ئەی ئەبو هورەیرە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی پێمگەیشتی من لەشم گرانبوو، پێم خۆش نەبوو لە خزمەتتدا دابنیشم تا خۆم نەشۆم. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پاک و بێگەردی بۆ خوا، بەڕاستی مسوڵمان پیس نابێ.

## چۆنیەتی دەرکردنی لەشگرانی و، دەستگرتن بەئەندازەی ئەو ئاوەی بەکاردەهێنرێ

٧٢١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ اغْتَسَلَ، ثُمَّ يُخَلِّلُ بِيَدَيْهِ شَعْرَهُ، حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشَرَتَهُ، أَفَاضَ عَلَيْهِ الْمَاءَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ[2].

---

(١) أخرجه مسلم: ٣٧١.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٧٢.

عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێک خۆی شۆردبایە لە لەشگرانی، (سەرەتا) هەردوو دەستی دەشۆرد، پاشان دەستنوێژی دەگرت، وەک چۆن دەستنوێژی دەگرت بۆ نوێژ، پاشان خۆی دەشۆرد، ئنجا دەستی دەخستنە نێو پرچی تا دڵنیا دەبوو پێستەکەی تەڕ بووە، دوایی سێ جاران ئاوی پێدا دەکرد، پاشان هەموو لاشەی دەشۆرد.

## تەیەموم کردن بۆ کەسی لەشگران لە کاتی نەبوونی ئاو

خوا دەفەرموێ: ﴿... فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ ...﴿٦﴾﴾ المائدة، واتە: ئاویشتان چنگ نەکەوت، ئەوە ڕوو بکەنە ڕووی پاکی زەوی و پاش دەست پێداهێنانی، دەست بە ڕووتان و دەستەکانتاندا بێنن.

**٧٢٢-** عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﵄، قَالَ: بَعَثَنِي اَلنَّبِيُّ ﷺ فِي حَاجَةٍ، فَأَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَتَمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كَمَا تَمَرَّغُ الدَّابَّةُ، ثُمَّ أَتَيْتُ اَلنَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا»، ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ اَلْأَرْضَ ضَرْبَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ مَسَحَ الشِّمَالَ عَلَى اَلْيَمِينِ، وَظَاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ[1].

عەممارى کوڕى یاسر ﵄، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ پێداویستیەک، لەشگران بووم و، ئاویشم دەست نەکەوت، خۆم لە خۆڵ گەوزاند، وەک چۆن ئاژەڵ خۆی لە خۆڵ دەگەوزێنێ، پاشان چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی: ئەوەندەت بەس بوو، کە ئاوا بکەی، (پێغەمبەری خوا ﷺ) یەک جار لەپی دەستی بە زەوی دادا، فووی لێکرد بە دەم و چاوو پشتی دەستیدا هێنا.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٤٧، ومسلم: ٣٦٨، وهذا اللَّفْظُ لِمسلم.

## سوڕی مانگانەو خوێنی ئیستحاضە

٧٢٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ، سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ فَلا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاةَ؟ قَالَ: «لاَ، إِنَّ ذَلِكَ عِرْقٌ، وَلَكِنْ دَعِي الصَّلاةَ قَدْرَ الأَيَّامِ الَّتِي كُنْتِ تَحِيضِينَ فِيهَا، ثُمَّ اغْتَسِلِي وَصَلِّي»[1].

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، گوتی: من خوێنی (نەخۆشیم) هەیە پاک نابمەوە، ئایا واز لە ئەنجامدانی نوێژ بێنم؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: نەخێر، ئەمە دەمارێکە، تەنیا بە ئەندازەی ئەوەندە ڕۆژە واز لە ئەنجامدانی نوێژ بێنە کە تێیدا دەکەویە سووڕی مانگانەوە، پاشان خۆت بشۆرەو نوێژ ئەنجامبدە.

## مسوڵمان پیس نابێ پیاوی لەشگران و ئافرەتی حەیزدار پیس نین

٧٢٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، كِلاَنَا جُنُبٌ، وَكَانَ يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ، فَيُبَاشِرُنِي وَأَنَا حَائِضٌ، وَكَانَ يُخْرِجُ رَأْسَهُ إِلَيَّ، وَهُوَ مُعْتَكِفٌ، فَأَغْسِلُهُ وَأَنَا حَائِضٌ[2].

عائیشە ﵂ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆمان دەشۆرد لە یەک تەشتدا، هەردووکیشمان لەشگران بووین، فەرمانی پێدەکردم نێوان ناوک و ئەژنۆم داپۆشم، ئنجا نزیکم دەکەوتەوەو دەستی بەرم دەکەوت، لە کاتێکدا من لە سووڕی مانگانەشدا بووم، هەروەها کاتێ ئیعتیکافی دەکرد (لە مزگەوت) سەری دەهێنایە ژوورەوە بۆ لام، منیش (قژیم) دەشۆرد، لە کاتێکدا لە سووڕی مانگانەدا بووم.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٢٥، ومسلم: ٣٣٣، واللَّفْظُ للبخاري.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٩٥.

## ئاسانكاری لەسەر خەڵك
## كاتێ خواردن ئامادە دەبێ لە كاتی نوێژدا

ئەویش لە جێبەجێ كردنی فەرمایشتی خوایە: ﴿... يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ...﴿١٨٥﴾﴾ البقرة، واتە: خوا ئاسانی بۆتان دەوێ و، نایەوێ سەغڵەتتان بكات.

٧٢٥- عَنِ ابْنِ عُمرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَ عَشَاءُ أَحَدِكُمْ، وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ، وَلاَ يَعْجَلْ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهُ»[1].

ئیبنو عومەر ﵄، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خواردن بۆ یەكێكتان دانراو، قامەت بۆ نوێژ كرا، سەرەتا دەست بكەن بە نان خواردن، با (ئەو كەسە) پەلە نەكات هەتا خواردنەكەی تەواو دەكات.

## ئامادە بوونی ئافرەتان بۆ نوێژی بەكۆمەڵ لە مزگەوت

٧٢٦- عَنْ عَبْدِ اللّه بْنِ عُمَرَ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا اسْتَأْذَنَتْ أَحَدَكُمْ امْرَأَتُهُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلاَ يَمْنَعْهَا»[2]

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خێزانی هەر یەكێكتان مۆڵەتی خواست بۆ هاتنە مزگەوت، با ڕێی لێ نەگرێ.

## دوو ڕكاتی سوننەتی بەرەبەیان

٧٢٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُدًا عَلَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٧٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٤١٦٦.

(٣) أخرجه البخاري: ١١٦٩.

عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هیچ سوننەتێک لە سوننەتەکان ئەوەندەی دوو ڕکاتی بەرەبەیان (واتە: پێش نوێژی بەیانی) پابەند نەبووە پێیەوە. (واتە: زۆر سوور بووە ئەم دوو ڕکاتە بکات).

## نوێژە سوننەتەکانی دوای نوێژی فەڕز

وەک فەرموودەی قودسی خوا: (بەردەوام بەندەکەم لێم نزیک دەبێتەوە بە سوننەتەکان هەتا خۆشم دەوێ)[1].

**٧٢٨ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الجُمُعَةِ، وَرَكْعَتَينِ بَعدَ المَغْرِبِ، وَرَكْعَتَينِ بَعدَ العِشَاءِ[2].**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی (سوننەتم) کردن، دوو ڕکات پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای هەینی، دوو ڕکات دوای مەغریب، وە دوو ڕکات دوای عیشا.

## بانگدان بە جووت و، قامەت کردنیش بە تاک

**٧٢٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ[3]**

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: فەرمانکرا بە بیلال کە جووت جووت بانگ بدات و، بە تاک تاکیش قامەت بکات.

---

(١) أخرجه البخاري: ١١١٢.

(٢) أخرجه البخاري: ١١٦٥.

(٣) أخرجه البخاري: ٦٠٦.

## ئیمام هانی نوێژ خوێنان دەدات بۆ ئەوەی ڕیزەکانیان ڕێک بخەن

**٧٣٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه ﷺ: «سَوُّوا صَفُوفَكمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ»[1].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕیزەکانتان ڕێک و ڕاست بکەن، چونکە ڕێک و ڕاستی ڕیز، لە تەواوی نوێژە.

## پێویستە لەسەر نوێژ خوێنان شوێن ئیمام بکەون

**٧٣١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سَقَطَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى بِنا قَاعِدًا، فَقَعَدْنَا؛ فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ، قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ؛ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَع فارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا»[2].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەسپێک کەوتە خوارەوە لای ڕاستیی بریندار بوو، ئێمەش چووینە لای وەک نەخۆش سەردانمان کرد، کاتی نوێژکردن هات، نوێژی بۆ کردین بە دانیشتنەوە، ئێمەش دانیشتین، کە نوێژ تەواو بوو، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بێگومان ئیمام تەنیا بۆ ئەوە دانراوە پەیڕەوی بکرێ، ئەگەر (اللّه أكبر)ـی کرد ئێوەش (اللّه أكبر) بکەن، وە ئەگەر چووە ڕکووع بردن ئێوەش ڕکووع ببەن، ئەگەر هەڵساوە هەڵسنەوە، وە ئەگەر گوتی: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) وە ئەگەر سوجدەی برد ئێوەش سوجدە ببەن.

---

(١) أخرجه البخاري: ٧٢٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٧٣٤.

## ڕەحمەتی خوایە کە بە هۆی پەرستشێکی ئاسانەوە دەمانخاتە بەهەشتەوە

وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء.

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆمان نەناردوە مەگەر وەک بەزەییەک بۆ هەموو جیهانییان.

٧٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کاتێک ئیمام گوتی: (آمین)، ئێوەش بڵێن (آمین)، ئەگەر هەر یەکێک لەگەڵ فریشتەکان بڵێ: (آمین)، ئەوە خوا لە هەموو گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ.

## ئیمام کاتێ نوێژ بۆ خەڵکی دەکات نوێژەکەی درێژ نەکاتەوە

٧٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ، فَلْيُجَوِّزْ؛ فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ، وَالْكَبِيرَ، وَذَا الْحَاجَةِ»[2].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان ئێوە هەندێکتان تێدایە کە خەڵکی دووردەخەنەوە (لە دینداری)، با هەر یەکێکتان کە پێشنوێژی بۆ خەڵک دەکات نوێژەکەی کورت بێ، چونکە خەڵکی بێ توانا و بە تەمەن و خاوەن کاریان تێدایە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٤٧٥.

(٢) أخرجه البخاري: ٧٠٢.

## دوعای دەست پێکردنی نوێژ

**٧٣٤-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى اَلصَّلَاةِ قَالَ: «وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفَاً، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاتِي، وَنُسُكِي، وَمَحْيَايَ، وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ»[١].

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەستی کردبایە بە نوێژ دەیفەرموو: ڕووم کردە ئەو زاتەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە بە نیەت و مەبەستێکی پاک و سروشتەوەو لە هاوبەشدانەران نیم، بە ڕاستی نوێژ و سەربڕین و ژیان و مردنم تەنیا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییانە، هیچ هاوبەشێکی نییە، وە بەوە فەرمانم پێکراوەو من لە مسوڵمانانم.

## خوێندنی سوورەتی فاتیحە یەکێکە لە پایەکانی نوێژ

**٧٣٥-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»[٢].

عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی نەکردوە ئەو کەسەی سوورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێ.

## ئەو کەسەی بە هەڵە نوێژی کردو پێغەمبەریش ﷺ فێری پایەکانی نوێژی کرد

**٧٣٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلرَّجُلِ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا»[٣]

---

(١) أخرجه مسلم: ٧٧١.

(٢) أخرجه البخاري: ٧٥٦.

(٣) أخرجه البخاري: ٧٥٧.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ئەگەر هەڵسایت بۆ نوێژ (اللّه أكبر) بکە، پاشان چەند لە قورئان (خوا بۆی) ئاسان کردی بیخوێنە، ئنجا بڕۆ بۆ ڕکووع هەتا دڵنیا دەبی ڕکووعت بردوە، پاشان هەڵسەوە هەتا بە تەواوی ڕێک دەبیت، پاشان سوجدە ببە هەتا دڵنیا دەبیت سوجدەت بردوە، ئنجا سەرت بەرزبکەرەوە هەتا دڵنیا دەبیت دانیشتووی، پاشان لە هەموو نوێژەکەتدا ئەمە بکە.

## ئەوەی نوێژ خوێن دەیخوێنێ لە دانیشتنی تەحیاتدا

**٧٣٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، فَكَانَ يَقُولُ: «التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ للهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّه وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللّه الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ»[1].

ئیبنو عەبباس ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری شایەدی تەحیاتی دەکردین، وەکو چۆن سوورەتێکی قورئانی فێر دەکردین، دەیفەرموو: هەرچی گەورەیی و پیرۆزی و پاڕانەوەو وتەی جوان و کردەوەی پاکە تەنیا بۆ خوایە، سڵاوو ڕەحمەت و بەرەکەت لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، سڵاو لەسەر ئێمە و هەموو بەندە چاکەکان، شایەدی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بە هەق نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەد پێغەمبەری خوایە.

---

(١) أخرجه مسلم: ٤٠٣.

## چۆنیەتی دانانی پەنجەکانی دەستی ڕاست
## لە کاتی تەحیات و جوڵاندنی پەنجەی شایەتمان

٧٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ ﵄، قَالَ: كَانَ النَّبيُّ ﷺ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلاَةِ، وَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى، عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَقَبَضَ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ الَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ، وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى[١].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دابنیشتایە بۆ نوێژ لەپی دەستی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەناو هەموو پەنجەکانی دەنوقاند و بە پەنجەی شایەتمان ئاماژەی دەکرد، وە لەپی دەستی چەپی لە سەر ڕانی چەپی دادەنا.

٧٣٩- حَدِيث ابْنِ الزُّبَيْرِ ﵄، بلَفظ: كَانَ يُشِيرُ بِالسَّبَّابَةِ وَلاَ يُحَرِّكُهَا[٢].

فەرموودەی ئیبنو زوبەیر ﵄، بەم بێژە هاتوە: بە پەنجەی شایەتمان ئاماژەی دەکرد و نەیدەجوڵاندەوە.

ڕیوایەتی دیکە هەیە، کە دەڵێ: دەیجوڵاند، ئەوە خیلافی کۆنە لە نێوان زانایان تازە دەبێتەوە، إن شاء الله هەردوو مذهب ئەوەی دەیجوڵێنن و ئەوەی نایجوڵێن موافقی سوننەتن، بە گوێرەی ئەو زانایانەی کە جوڵاندنیان بە صحیح داناوەو، ئەوانەش کە جوڵاندنیان بە (ضعیف) داناوە.

## ئەوەی نوێژ خوێن دەیکات لە کاتی چوونە مزگەوتەوە

٧٤٠- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ»[٣].

---

(١) أخرجه مسلم: ٥٨٠.

(٢) عند أحمد وأبي داود والنسائي وابن حبان في صحيحه، وقال النووي في شرح المهذب، ٣ ٤٥٤: إسناده صحيح، وقال الحافظ ابن حجر في التلخيص الحبير١/٤٢٦: وهذا الحديث أصله في مسلم دون قوله: ولا يجاوز بصره إشارته.

(٣) أخرجه البخاري: ٤٤٤.

ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان چووە نێو مزگەوت، با دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێ.

## شێوەی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

**٧٤١-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، قَالَ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ عَلَيْنَا، فقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: قُولُوا: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[1].

کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ هاتە دەر بۆلامان، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە زانیمان چۆن سڵاوت لێ بکەین، ئایا ئەدی چۆن صەڵاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: خوایە! ڕەحمەت بڕێژە بۆ سەر موحەممەد، وە ئالی موحەممەد (خێزان و ئامۆزاکان و شوێنکەوتووانی دەگرێتەوە)، هەر وەک چۆن ڕەحمەتت ڕژاندە سەر ئیبڕاهیم و ئالی ئیبڕاهیم و شوێنکەوتووانی، بێگومان تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت، خوایە! پێزو بەرەکەت بڕێژە سەر موحەممەد، وە خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، هەروەک چۆن پێزو بەرەکەتت ڕژاندە سەر ئیبڕاهیم و خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، بە ڕاستی تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت.

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٣٥٧ و ٣٣٧٠.

## لەو پاڕانەوانەی کە هاتوون
## دوای صەڵاواتی ئیبراهیمی پێش سەلامدانەوە

٧٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ»[1]

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان شایەتمانی خوێند، ئەوە با پەنا بە خوا بگرێ لە چوار شت: بڵێ: ئەی خوایە! من پەنا بە تۆ دەگرم لە سزای دۆزەخ، وە لە سزای ناو گۆڕ، لە بەڵای ژیان و مردن، لە بەڵاو ئاژاوەی مەسیحی دەجال.

## سوننەتە ئیمام کە نوێژ بۆ خەڵک دەکات سووڕەتە کورتەکان بخوێنێ

٧٤٣- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِمُعَاذٍ: «فَلَوْلاَ صَلَّيْتَ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى، فَإِنَّهُ يُصَلِّي وَرَاءَكَ الْكَبِيرُ، وَذُو الْحَاجَةِ، وَالضَّعِيفُ»[2].

جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە موعازی فەرموو: ئەگەر نوێژت کرد ئەم سووڕەتانە بخوێنە: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) چونکە کەسانی بە تەمەن و خاوەن پێداویستی و لاواز نوێژت لە دوا دەکەن.

## تێپەڕ بوونی منداڵ و ئافرەت بە پێشی نوێژ خوێندا نوێژەکەی نابڕێ

٧٤٤- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرِجْلاَيَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا، وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ[3].

---

(١) أخرجه مسلم: ٥٨٨.

(٢) أخرجه البخاري: ٧٠١ و ٧٠٥.

(٣) أخرجه البخاري: ٣٨٢.

عائیشە ﵂ دەڵێ: من دەخەوتم لە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ قاچەکانم لەو شوێنە بوو قیبلەی ئەو بوو (بۆ نوێژکردن)، (پێغەمبەر ﷺ) ئەگەر سوجدەی ببردبایە لە قاچمی دەدا (وەک ئاگادار کردنەوە) منیش قاچم دەکێشاوەو کۆدەکردەوە، ئەگەر هەڵسابا درێژم دەکردەوە، ماڵەکان ئەو کات چرایان تێدا نەبوو.

## ئەوەی دروست نییە لە قسە کردن لە نێو نوێژ

خوا دەفەرموێ: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾ البقرة. واتە: بە ملکەچی و بێ دەنگ بۆ خوا بوەستن.

٧٤٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﵁ قَالَ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلاَةِ، يُكَلِّمُ أَحَدُنَا أَخَاهُ فِي حَاجَتِهِ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾ البقرة، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ[1].

زەیدی کوڕی ئەرقەم ﵁، دەڵێ: ئێمە (عادەتمان وابوو) لە نوێژ لەگەڵ یەکدی قسەمان دەکرد، یەکێکمان لەگەڵ برایەکەی قسەی دەکرد ئیشێکی پێبووایە دەیدواند، هەتا ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾ البقرة، واتە: پارێزگاریی لە نوێژەکانتان بکەن، وە نوێژی ناوەڕاست بە تایبەت، وە بۆ خوا بە ملکەچیی بێ دەنگ ڕابوەستن. فەرمانمان پێکرا بێدەنگ بین.

## کەفارەتی ئەو کەسەی نوێژێکی لە بیر دەچێ

٧٤٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَسِيَ صَلاَةً، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ»، وَأَقِمِ الصَّلاَةَ لِذِكْرِي[2].

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٢٦٠، زانایان دوو بۆچوونیان هەیە دەربارەی نوێژی نێوەڕاست: هەندێک گوتوویانە: نوێژی نیوەڕۆیە، هەندێک گوتوویانە: نوێژی عەسرە.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٩٧.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک نوێژی لە بیرچوو (لە کاتی خۆیدا بیکات)، ئەوە هەرکات بیری هاتەوە با نوێژەکەی بکات، چونکە ئەمە هیچ کەفارەتێکی بۆ نییە، جگە لە ئەنجامدانی نوێژەکە، خوای بەرز دەفەرموێ: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي)[1] واتە: نوێژ ئەنجام بدەن تاکو یادی منی تێدا بکەن.

## نوێژی ویتر

٧٤٧- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كُلَّ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وانْتَهى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ[2].

عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەوێک ویتری دەکرد، ویترەکەی کۆتایی پێدەهێنا لە پارشێو.

مەبەست ئەوەیە: هەر چۆنێک بۆی کرابێ، کردوویەتی، هەندێک جار لە سەرەتای شەو ویترەکەی کردوە، هەندێک جار لە ناوەڕاستی شەو ویترەکەی کردوە، هەندێک جار لە کۆتایی شەو ویترەکەی کردوە، هەندێک جار حەزی کردوە لە سەحەر، واتە: پێش بانگی بەیانی ویترەکەی تەواو بکات، بەڵام بە پێی توانا، ئەوەش وەک ئاسانکاریی بۆ مسوڵمانان.

## داوای لێخۆشبوون دوای سەلام دانەوە

٧٤٨- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُحَدِّثُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلَاتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلَاثًا، وَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ»[3].

---

(١) سورة طه: ١٤.

(٢) أخرجه البخاري: ٩٩٦.

(٣) أخرجه مسلم: ٥٩١.

ثەوبان ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە نوێژ تەواو دەبوو، سێ جار داوای لێخۆشبوونی دەکرد، وە دەیفەرموو: خوایە تۆ سەلامی، ئاشتی و سەلامەتیش لە تۆوەیە، بەرزی و پیرۆزی بۆ تۆیە، ئەی خاوەن دەسەڵات و گەورەیی و ڕێز.

## کۆکردنەوەی نوێژ لە نێوان نیوەڕۆ و عەسر و، مەغریب و عیشا

هەروەها کورتکردنەوەی ئەو نوێژانەی چوار ڕکاتن لە سەفەردا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ... ﴿١٠١﴾ ﴾ النساء، واتە: وە (ئەی بڕوادارینە!) هەرکات بەزەویدا ڕۆیشتن ئەگەر ترسان ئەوانەی بێبڕوان ئازارتان بدەن، گوناهتان ناگات ئەگەر لە نوێژەکەتان کورت بکەنەوە.

٧٤٩- عَنْ عَبْدِ اللّه بْنِ عَبَّاس ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاَةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، إِذَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ، وَيَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری کۆدەکردنەوە، کاتێک لە سەفەر بووایە، نوێژی مەغریب و عیشای کۆدەکردنەوە.

٧٥٠- عَنْ عَبْدِ اللّه بْنِ عَبَّاس ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ»[2].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا حەز دەکات و پێی خۆشە مۆڵەتەکانی وەربگیرێن، هەروەک چۆن پێی خۆشە ئەرکە قورسەکانیشی جێبەجێ بکرێن.

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٠٧.

(٢) أخرجه أحمد: ٥٨٦٦، والبزار: ٩٨٨، والطبراني في الأوسط: ٥٣٠٢، قال الهيثمي (١٦٢/٣): رواه أحمد، ورجاله رجال الصحيح، والبزار والطبراني في الأوسط وإسناده حسن، وأخرجه إبن حبان برقم: ٣٤٥، واللفظ له، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

نوعمانی کوڕی بەشیر ﵄، دەڵێ: بابم لە هەندێک لە ماڵەکەی بە دیاری دامێ، دایکیشم کە عومرەی کچی ڕەواحە گوتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ شایەد نەبێ لەسەری، بابیشم چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی شایەد بێ لەسەر ئەو ماڵەی بە منی داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو کارەت بۆ هەموو منداڵەکانت کردوە؟ گوتی: نەخێر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پارێز لە خوا بکەن و، لە نێوان منداڵەکانتان دادگەربن، باوکم گەڕایەوەو دیارییەکەی لێ وەرگرتمەوە.

## پێغەمبەر ﷺ لێدانی ئافرەتانی قەدەغە کردوە

٨٢٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَجْلِدُ أَحَدُكُمْ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ ثُمَّ يُجَامِعُهَا فِي آخِرِ الْيَوْمِ»[1].

عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێکتان لە هاوسەرەکەی نەدات وەک لێدانی کۆیلە، پاشانیش بچێ لە کۆتایی ڕۆژەکەدا، لەگەڵی جووت بێ،

وە هەمان ڕیوایەت لای ئیبنو سەعد هاتوە، دەڵێ: ئایا پیاوێک لە ئێوە شەرم ناکات لە سەرەتای ڕۆژ دەست بەرز بکاتەوە لە خێزانەکەی و، ئێوارەش دەست بکاتە ملی!

٨٢٨- عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ طَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ نِسَاءٌ كَثِيرٌ يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ، لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُمْ»[2].

واتە: ئیاسی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو زوباب ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە ڕاستی ئافرەتانێک هاتن بۆ لای خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ سکاڵایان لە هاوسەرەکانیان دەکرد کە لێیان دەدەن، ئەوانە کەسانێکی باش نین.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٢٠٤، وابن حبان: ٤١٩٠.

(٢) أخرجه أبو داود: ٢١٤٨، وصَحَّحَهُ الألباني.

## ئەو هاوسەرگیریەی کە قەدەغەکراوە

٨٢٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ[١].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭭ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ژن بە ژنی بکرێ.

## پیاوان و ئافرەتان بنەمای مرۆڤایەتین و بەشدارن لە چاکەکاریی

٨٣٠- عَنْ عَائِشَةَ ﭫ، قَالَتْ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ»[٢].

عائیشە ﭫ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتان هاوتای پیاوانن.

.٨٣١- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﭬ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ[٣].

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﭬ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی خەیبەر هاوسەرگیری موتعەو، خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغەکرد.

## ئامۆژگاری خوێنەر بە زۆر یادی خواو سوپاسکردن و بە پاکگرتنی

٨٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ»[٤].

---

(١) أخرجه البخاري: ٥١١٢، والشِّغارُ: أن يزوِّجَ الرَّجُلُ ابنَتَه على أن يزوِّجَه الآخَرُ ابنَتَه، ليس بينهما صَداقٌ.

(٢) أخرجه الإمام أحمد في باقي مسند الأنصار من حديث أم سليم بنت ملحان ح ٥٨٦٩، والترمذي في كتاب الطهارة ح ١٠٥، وهو حديث حسن صحيح. وقال العلامة ابن باز رحمه الله تعالى هذا حديث صحيح والمعنى والله أعلم أنهن مثيلات الرجال إلا ما استثناه الشارع، كالإرث والشهادة وغيرهما مما جاءت به الادلة.

(٣) أخرجه مسلم: ٣٤٩٩.

(٤) أخرجه البخاري: ٦٠٤٣، ومسلم: ٧٠٢١.

ئەبو هورەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو وشە هەن زۆر سووکن لە سەر زمان، گران و قورسن لە تەرازوو (ی کردەوەکان)، خۆشەویستن لە لای ڕەحمان (واتە: خوا)، کە بریتین لە: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ)، واتە: پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ خوای گەورەو مەزن.

## کلیلی چوونە ناو بەهەشت

**٨٣٣-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللَّهُ ﷺ: مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةِ»، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ»، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ»، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ»، وَكَانَ أَبُو ذَرٍّ إِذَا حَدَّثَ بِهَذَا قَالَ: وَإِنْ رَغِمَ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ[1].

ئەبو زەڕی غیففاری ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ بەندەیەک نییە، بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله)، پاشان بمرێ لەسەر ئەو حاڵەتە ئیللا دەچێتە بەهەشت، گوتم: ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبێ ؟ فەرمووی: وە ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبی؟ گوتم: ئەگەر زینای کردبێ، وە ئەگەر دزیشی کردبێ ؟ فەرمووی: وە ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبێ؟ گوتم: ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبی؟ فەرمووی: ئەگەر زینای کردبێ، وە ئەگەر دزیشی کردبێ؟ وە ئەگەر لووتی ئەبوو زەڕ بە خۆڵ دا بچێ، وە ئەبوو زەڕ کاتێک ئەم حەدیسەی دەگێڕایەوە، هەر دەیگوت: وە ئەگەر لووتی ئەبوو زەڕیش بە خۆڵدا بچێ!!

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٤٨٩، واللَّفْظُ لَهُ، ومسلم: ٢٨٣.

## دوعای دڵ چەسپان لەسەر دینداریی

٨٣٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ»[١].

ئوممو سەلەمە دایکی بڕواداران ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆرجار دەیفەرموو: ئەی هەڵگێڕەوەی دڵان! دڵم لەسەر دینەکەت بچەسپێنە.

## نوێژ کارێکی زۆر گەورەیە

٨٣٥- عَنْ ثَوْبَانَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ خَيْرَ أَعْمَالِكُمُ الصَّلَاةُ، وَلَا يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلَّا مُؤْمِنٌ»[٢].

واتە: سەوبان ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەست بەوەوە بگرن کە ڕاستە نزیک ببنەوە، (واتە: شتێکی گران مەخەنە ئەستۆی خۆتان کە لە تواناتاندا نەبێ)، بزانن باشترینی کردەوەکانتان نوێژە، (کەس) پارێزگاری لە دەستنوێژ ناکات جگە لە بڕوادار.

## مزگەوت ماڵی بڕوادارانە

٨٣٦- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، قَالَ: كَتَبَ سَلْمَانُ إِلَى أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵄: يَا أَخِي عَلَيْكَ بِالْمَسْجِدِ فَالْزَمْهُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْمَسْجِدُ بَيْتُ كُلِّ تَقِيٍّ»[٣].

---

(١) أخرجه ابن أبي حَاتِم: ٣٢٢٢، والطَّبري في تفسيره: ٦٦٥٠، والترمذي: ٢١٤٠، والطبراني في الكَبير: ٧٧٢، ورَوتْ عَائشَةُ ﵂ نَحوهُ، انظر: السلسة الصحيحة: ٢٠٩١.

(٢) أحمد: ٢٢٤٨٦، قال شُعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، إسناده حسن، وابن حبان: ١٠٣٧، والبيهقي في شعب الإيمان: ٢٧١٥.

(٣) أخرجه أبو نعيم فى الحلية: (٢١٤/١)، وابن عساكر: (١٥٣/٤٧)، وأخرجه أيضًا: عبد الرزاق: ٢٠٠٢٩، وهناد في الزهد: ٩٥١، وخيثمة فى جزء من حديثه (ص ٧١)، والطبراني في الأوسط: ٧١٤٩، والخطيب (٣٤٠/٨) ، والديلمى (٢١٧/٤)، حديث سلمان: أخرجه الطبراني: ٦١٤٣، والبيهقي في شعب الإيمان: ٢٩٥٠.

ئەبو عوسمان دەڵێ: سەلمانی فارسی نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو دەرداء ﷺ گوتی: ئەی براکەم تکایە پابەندبە بە مزگەوتەوە، چونکە بە دڵنیایی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: مزگەوت ماڵی هەموو کەسێکی پارێزکارە.

## سوننەتی چوونە ناو مزگەوت (تحية المسجد)

٨٣٧- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ السَّلَمِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ»(١).

ئەبو قەتادەی سەلەمی ﷺ، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان چووە ناو مزگەوت، با دوو ڕکات نوێژ بکات، پێش ئەوەی دابنیشێ.

## پاداشتی نوێژی بە کۆمەڵ

٨٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»(٢).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی بە کۆمەڵ بیست و حەوت جار خێری زیاترە لە نوێژی بە تەنیا.

## خوێندنی ئیخلاص و فەلەق و ناس لە دوای نوێژ

٨٣٩- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللّٰهِ ﷺ «اقْرَؤُوا الْمُعَوِّذَاتِ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ»(٣).

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٦٣٩، ومسلم: ٧١٤، واللفظ للبخاري، ولهما: فليركع ركعتين قبل أن يجلس، ولمسلم: فلا يجلس حتى يركع ركعتين.

(٢) أخرجه البخاري ٦١٩، ومسلم: ٦٥٠.

(٣) أخرجه ابن حبان: ٢٠٠٤، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده قوي.

عوقبەی کوڕی عامر ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سووڕەتی: ئیخڵاص و فەلەق و ناس بخوێنن، دوای هەموو نوێژێک.

## گرنگی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

٨٤٠- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْبَخِيلَ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ»[(١)].

عەلی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەزیل ئەو کەسەیە ناوی منی لەلا دەهێنرێ و صەڵاواتم لەسەر نادات.

## تەوبەی ڕاست گوناهان ناهێڵێ

٨٤١- عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ، كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ»[(٢)].

ئەبو عوبەیدەی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی تۆبە لە گوناهەکانی دەکات وەکو ئەو کەسە وایە کە گوناهی نەبێت.

## لادانی ئەزیەت و ئازار لە ڕێگادا

٨٤٢- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ، قَالَ: «أَمِطِ الْأَذَى عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ»[(٣)].

---

(١) أخرجه ابن حبان: ٩٠٩، والبيهقي في شعب الإيمان: ١٥٦٧، والنسائي في الكبرى: ٩٨٨٣، وأبو يعلى: ٦٧٧٦، والحاكم: ٢٠١٥، وقال: صحيح الإسناد.

(٢) أخرجه ابن ماجه: ٤٢٥٠، والطبراني: ١٠٢٨١، وقال الهيثمي (١٠/٢٠٠): رجاله رجال الصحيح، إلا أن أبا عبيدة لم يسمع من أبيه، والبيهقي: ٢٠٣٤٨. قال المنذرى (٤٨/٤): رواه ابن ماجه والطبراني كلاهما من رواية أبي عبيدة ابن مسعود عن أبيه ، ولم يسمع منه، ورواة الطبراني رواة الصحيح، وقال المناوي (٢٧٦/٣): قال ابن حجر: حسن

(٣) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٢٢٨، وغيره، واللفظ للبخاري ﷺ.

ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنمایيم بكە بۆ كردەوەيەک بمخاتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: ئازار لە ڕێگەی خەڵكی لابدە (جا ڕێگەكە ڕێگەی حەقیقی بێ وەک شەقام، يانيش ڕێگەی مەجازی بێ وەک ڕێگەی بژێوو و ژيان).

## سزای خراپ بوون لەگەڵ دايک و باوک

٨٤٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَاقٌّ وَلَا مُدْمِنُ خَمْرٍ وَلَا مَنَّانٌ»(١).

عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی: ئەو كەسەی خراپ بێ لەگەڵ دايک و باوكی و ئەو كەسەش كە بەردەوامە لەسەر عەرەق خواردنەوە ناچنە بەهەشتەوە.

## هاندان بۆ چاكبوون لەگەڵ دايک و باوک

٨٤٤- عَنْ عَبْد اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ العَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الصَّلَاةُ لِوَقْتِهَا»، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: «بِرُّ الوَالِدَيْنِ»، قَال: قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: «الجِهَادُ فِي سَبيلِ اللَّهِ»(٢).

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پرسيارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد: چ كردەوەيەک لە هەموو كردەوەكان چاكترە؟ فەرمووی: نوێژ لە كاتی خۆيدا، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: چاكە لەگەڵ دايک و باب، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: جيهادو تێكۆشان لە پێناوی خوادا.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٩٨٦، قَالَ شُعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٠٤، ومسلم: ٨٥، والنسائي: ٦١٠، وابن حبان: ١٤٧٧.

## دایک لە پێشترین کەسە بۆ چاکەکردن لەگەڵی

٨٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَتَى رَجُلٌ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَا تَأْمُرُنِي؟ فَقَالَ: «بِرَّ أُمَّكَ»، ثُمَّ عَادَ، فَقَالَ: «بِرَّ أُمَّكَ»، ثُمَّ عَادَ، فَقَالَ: «بِرَّ أُمَّكَ»، ثُمَّ عَادَ الرَّابِعَةَ، فَقَالَ: «بِرَّ أَبَاكَ»»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: بە چی فەرمانم پێدەکەی؟ فەرمووی: چاکەکاربە لەگەڵ دایکت، دوایی پیاوەکە دووبارەی کردەوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) هەر فەرمووی: چاکەکاربە لەگەڵ دایکت، پاشان (پرسیارەکەی سێ بارە کردەوە) هەر فەرمووی: چاکەکاربە لەگەڵ دایکت، ئنجا بۆ جاری چوارەم کە پرسیاری لێکردەوە (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: چاکەکاربە لەگەڵ باوکت.

## هاندان لەسەر گوێڕایەڵی دایک و باوک

٨٤٦- عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَّا بَرًّا بِوَالِدَيْهِ فَأَمَرَاهُ أَوْ أَمَرَهُ أَحَدُهُمَا أَنْ يَتَزَوَّجَ، فَتَزَوَّجَ، فَوَقَعَ بَيْنَ أُمِّهِ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ شَرٌّ، وَوَافَقَهُ أَهْلُهُ، فَقَالَتْ لَهُ أُمُّهُ: طَلِّقْهَا، قَالَ: فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ أَنْ يُطَلِّقَ امْرَأَتَهُ، وَاشْتَدَّ عَلَيْهِ أَنْ يَعُقَّ أُمَّهُ، قَالَ: فَرَحَلَ إِلَى أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، فَقَصَّ عَلَيْهِ قِصَّتَهُ، فَقَالَ: مَا كُنْتُ آمُرُكَ أَنْ تُطَلِّقَ امْرَأَتَكَ، وَلا أَنْ تَعُقَّ أُمَّكَ، وَلَكِنْ إِنْ شِئْتَ حَدَّثْتُكَ حَدِيثاً سَمِعْتُهُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ: «الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، فَحَافِظْ إِنْ شِئْتَ أَوْ ضَيِّعْ»[2].

ئەبو عەبدەڕەحمان دەڵێ: پیاوێک لە ئێمە لەگەڵ دایک وبابی زۆر چاکەکار بوو، فەرمانیان پێکرد یاخود یەکێکیان فەرمانی پێکرد کە ژن بهێنێ، ژنی هێنا، کێشەیەک لە نێوان دایکی و ژنەکەی ڕوویدا، کە ئەهلەکەی پێی ڕازیبوون، دایکی گوتی: ئەم ژنە تەڵاق بدە، دەڵێ: ئەویش زۆر لەسەری توند بوو کە

---

(١) أخرجه أحمد: ٩٢٠٧، تعليق شُعيب الأرنؤوط: صحيح وهذا إسناد حسن.

(٢) أخرجه الترمذي: ١٩٠٠، وقال: حديث صحيح، وصَحَّحَهُ الألباني في السلسلة الصحيحة: ٩١٤.

خێزانەکەی تەڵاق بدات، وە پێشی ناخۆش بوو سەرپێچیی فەرمانی دایکی بکات، چوو بۆ لای ئەبوو دەرداء ﷺ چیرۆکەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە، (ئەبو دەرداء ﷺ گوتی:) من ناڵێم ژنەکەت تەڵاق بدە، وە ناشڵێم سەرپێچی دایکت بکە، بەڵکو فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستوە، (فەرموویەتی: باب دەرگای نێوەڕاستی بەهەشتە، ئەگەر دەتەوێ بیپارێزەو دەستی پێوە بگرە، یان لە دەست خۆتی بدەو زایەی بکە! واتە: ئەگەر باب دەرگای نێوەڕاستی بەهەشت بێ، دەبێ دایک چ بێ؟!!

## بە چاکە مامەڵەکردن لەگەڵ برادەران

٨٤٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ الأَصْحَابِ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الْجِيْرَانِ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ»[1].

عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین برادەر لە لای خوا ئەو برادەرەیە کە زۆر باشبێ بۆ برادەری خۆی، وە باشترین دراوسێ لە لای خوا ئەو دراوسێیەیە کە بۆ دراوسێیەکەی زۆر باشبێ.

## بە بەزەیی بوون لەگەڵ بچووک و ڕێزگرتنی گەورە

٨٤٨- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيُجِلَّ كَبِيرَنَا، فَلَيْسَ مِنَّا»[2].

ئەبو ئومامە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەزەیی نەنوێنێ بەرانبەر بچووکەکانمان، وە ڕێز لە گەورەکانمان نەگرێ، ئەوە لە ئێمە نییە.

---

(١) أخرجه إبن حبّان: ٥١٨، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٣٥٣، قال الألباني: حسن صحيح: انظر: السلسلة الصحيحة (٢١٩٦).

## حەز کردن بە چاکەی مسوڵمانان

٨٤٩- عَنْ أَنَسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ، مَا يُحِبُّ لِنَفسِهِ»(١).

ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێک لە ئێوە بە بڕوادار دانانرێ تاکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ براو (خوشکی مسوڵمانیشی) پێی خۆش نەبێ.

## زەردەخەنە کردن خێر و چاکەیە

٨٥٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ»(٢).

ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەردەخەنەو ڕووخۆشیت بۆ براکەت بە چاکە بۆت هەژمار دەکرێ.

## پێگە و پلەی هەڵگرانی قورئان

٨٥١- عَنْ عُمَر ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ»(٣).

پێشەوا عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا کۆمەڵێک بەرز دەکاتەوە بە هۆی ئەم کتێبە (واتە: قورئان)، وە هەندێکی دیکەشی پێ نزم دەکاتەوە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٢١٨٧.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٨٩١، والترمذي: ١٩٥٦، وقال: حسن غريب، وابن حبان: ٥٢٩، والبزار: ٤٠٧٠.

(٣) أخرجه أحمد: ٢٣٢، ومسلم: ٨١٧، وابن حبان: ٧٧٢، وغَيْرُهُمْ.

## پاداشتی خوێندنەوەی قورئان

٨٥٢- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لاَ أَقُولُ (أَلَم) حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ»(1).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پیتێک لە کتێبی خوا (واتە: قورئان) بخوێنێ چاکەیەکی بۆ هەیە، هەر چاکەیەکیش بە دە ئەوەندەی خۆی دەنووسرێ، ناشڵێم (الم) هەمووی یەک پیتە، بەڵکو ئەلیف پیتێکە و، لام پیتێکە و، میم پیتێکە.

## قورئان بەرزت دەکاتەوە

٨٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا»(2).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە هاوەڵی قورئان دەگوترێ (واتە: ئەو کەسەی قورئانی خوێندوە، یان دەرخی کردوە) کە دەچێتە بەهەشت، بخوێنەو بەرز بەوەو سەربکەوە، هەروەک لە دونیادا دەتخوێند، بێگومان شوێنی تۆ لە لای دوا ئایەتە کە دەیخوێنی.

## لە ئادابی مۆڵەت وەرگرتن بۆ چوونە ماڵێک

٨٥٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا مُوسَى ﷺ، اسْتَأْذَنَ عَلَى عُمَرَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَرَجَعَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ: مَا رَدَّكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَلْيَرْجِعْ»، فَقَالَ: لِتَجِئْنِي عَلَى هَذَا

---

(1) أخرجه الترمذي: ٢٩١٠، وقال: حَدِيث حسن صحِيح.

(2) أخرجه أحمد: ٦٧٩٩، وأبو داود: ١٤٦٤، والترمذي: ٢٩١٤، وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى: ٨٠٥٦، وابن حبان: ٧٦٦.

بِبَيِّنَةٍ، وَإِلَّا، قَالَ حَمَّادٌ: تَوَعَّدَهُ قَالَ: فَانْصَرَفَ فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَأَتَى مَجْلِسَ الْأَنْصَارِ فَقَصَّ عَلَيْهِمُ الْقِصَّةَ: مَا قَالَ لِعُمَرَ، وَمَا قَالَ لَهُ عُمَرُ، فَقَالُوا: لَا يَقُومُ مَعَكَ إِلَّا أَصْغَرُنَا، فَقَامَ مَعَهُ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ، فَشَهِدَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: إِنَّا لَا نَتَّهِمُكَ، وَلَكِنَّ الْحَدِيثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَدِيدٌ»[1].

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە، ئەبو مووسا ﵁ سێ جار داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی کرد لە عومەر ﵁، مۆڵەتی پێنەدرا، گەڕایەوە، ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە عومەر، گوتی: چی وای لێ کردی بگەڕێیتەوە؟ گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر یەکێک سێ جار داوای مۆڵەتی (چوونە ژوورەوەی) کرد، مۆڵەتی پێنەدرا، با بگەڕێتەوە، گوتی: لەسەر ئەم قسەیە بەڵگەم بۆ دەهێنی، ئەگەرنا -حەماد دەڵێ- هەڕەشەی لێکرد، گوتی: جا ئەویش ڕۆیشت چووە ناو مزگەوتەوە، هاتە ناو کۆڕی پشتیوانەکان و بۆیانی باس کرد: ئەوەی بە عومەری گوتبوو، وە ئەوەش کە عومەر پێی گوتبوو، گوتیان: کەس لە ئێمە لەگەڵتدا نایەت مەگەر بچوکترینمان، ئەبو سەعیدی خودری ﵁ لەگەڵیدا ڕۆیشت، شایەتی بۆ دا، عومەر ﵁ پێی گوت: ئێمە تۆمەتبارت ناکەین، بەڵکو گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبەرەوە بابەتێکی توندەو پێویستی بە جەختکردنەوە هەیە.

## چۆنیەتی مۆڵەت وەرگرتن بۆ چوونە ژوور

٨٥٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ، أَنَّ كَلَدَةَ بْنَ حَنْبَلٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ ﵁ بَعَثَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي الْفَتْحِ بِلَبَنٍ وَجِدَايَةٍ وَضَغَابِيسَ «أي: الْبَقْلَ» وَالنَّبِيُّ ﷺ بِأَعْلَى الْوَادِي، وَلَمْ أُسَلِّمْ وَلَمْ أَسْتَأْذِنْ، فَقَالَ: «ارْجِعْ، فَقُلِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ؟»، وَذَلِكَ بَعْدَمَا أَسْلَمَ صَفْوَانُ»[2].

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٩١، ومسلم: ٢١٥٣، وأبو داود: ٥١٨٠، وابن حبان: ٥٨٠٦.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد، وصَحَّحَهُ الألباني في السلسلة الصحيحة: ٢٠٩٢.

عەمڕی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان دەگێڕێتەوە (دەڵێ:) کەلەدەی کوڕی حەنبەل هەواڵی پێداوە، صەفوانی کوڕی ئومەییە ﷺ لە کاتی ئازاد کردنی مەککەدا ئەوی نارد بۆ بردنی شیرو ئاسک و پاقلە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ لە سەرووی دۆڵەکە بوو، جا نە سڵاوم کردو نە داوای مۆڵەتیشم کرد، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: بگەڕێوە، بڵێ: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ) ئایا بێمە ژوورەوە؟ ئەوەش پاش ئەو کاتە بوو کە صەفوان بوو بە مسوڵمان.

## گەورەیی چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ

٨٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يَأْخُذُ عَنِّي هَؤُلَاءِ الكَلِمَاتِ فَيَعْمَلُ بِهِنَّ أَوْ يُعَلِّمُ مَنْ يَعْمَلُ بِهِنَّ؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقُلْتُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَعَدَّ خَمْسَاً وَقَالَ: اتَّقِ المَحَارِمَ تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ، وَارْضَ بِمَا قَسَمَ اللَّهُ لَكَ تَكُنْ أَغْنَى النَّاسِ، وَأَحْسِنْ إِلَى جَارِكَ تَكُنْ مُؤْمِنًا، وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُسْلِمَاً، وَلَا تُكْثِرِ الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ القَلْبَ»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کێ هەیە ئەو چەند وشەیەم لێ وەربگرێ و کاریشیان پێ بکات، یان کەسانێک فێر بکات کە کاری پێ بکەن؟ ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: گوتم: من ئەی پێغەمبەری خوا، جا دەستی گرتم و تا پێنج شتی بۆ ژماردم، فەرمووی: خۆت لە حەڕامکراوەکان بپارێزە دەبیتە پارێزکارترینی خەڵکی، ڕازیبە بەو بەشەی خوا پێیداوی دەبیتە دەوڵەمەندترینی خەڵکی، چاکبە لەگەڵ دراوسێت دەبیتە بڕوادارێکی تەواو، هەرچی بۆ خۆت پێخۆشە بۆ خەڵکیش پێتخۆش بێت دەبیتە مسوڵمانێکی تەواو، زۆر پێ مەکەنە، چونکە بە دڵنیایی زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ.

---

(١) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٢٥٣.

## ڕەخنە نەگرتن لە خواردن

٨٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: مَا عَابَ النَّبِيُّ ﷺ طَعَامًا قَطُّ إِن اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِلَّا تَرَكَهُ[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ڕەخنە و گلەیی لە خواردن نەکردوە، ئەگەر حەزی لێبا دەیخوارد، ئەگەر نا دووردەکەوتەوە (ڕەخنەی نەدەگرت).

## لە ئادابی خواردن

٨٥٨- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَعَاهُ إِلَى طَعَامٍ، فَقَالَ: «تَعَالَ يَا بُنَيَّ، كُلْ مِمَّا يَلِيكَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ»[٢].

عەبدورڕەحمانی کوڕی موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە دەڵێ: باوکم لە باوکیەوە ﷺ بۆی گێڕاینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد بۆ لای خواردنێک فەرمووی: وەرە ئەی کوڕە بچکۆلەکەم، لە پێشی خۆتەوە بخۆ و بەدەستی ڕاستت بخۆ، وە ناوی خوای لەسەر بهێنە.

## بە تەنگەوەبوون و یارمەتیدانی یەکتری

٨٥٩- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «طَعَامُ الْوَاحِدِ يَكْفِي الِاثْنَيْنِ، وَطَعَامُ الِاثْنَيْنِ يَكْفِي الْأَرْبَعَةَ، وَطَعَامُ الْأَرْبَعَةِ يَكْفِي الثَّمَانِيَةَ»[٣].

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیفەرموو: خواردنی یەک کەس بەشی دووان دەکات، خواردنی دوو کەس بەشی چوار کەس دەکات، خواردنی چوار کەس بەشی هەشت دەکات.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٣٧٠

(٢) أخرجه ابن حبان: ٥٢١٢، قال شُعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٠٥٩، والترمذي: ١٨٢٠، وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى: ٦٧٧٤، وابن حبان: ٥٢٣٧.

## دوعای میوان بۆ خاوەنی خواردن

٨٦٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ السُّلَمِيِّ قَالَ: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى أَبِي فَنَزَلَ عَلَيْهِ، فَأَتَاهُ بِطَعَامٍ وَحَيْسٍ وَسَوِيقٍ وَتَمْرٍ، ثُمَّ أَتَاهُ بِشَرَابٍ فَنَاوَلَ مَنْ عَنْ يَمِينِهِ، قَالَ: وَكَانَ يَأْكُلُ التَّمْرَ وَيَضَعُ النَّوَى عَلَى ظَهْرِ أُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوسْطَى، ثُمَّ يَرْمِي بِهِ، ثُمَّ دَعَا لَهُمْ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِيمَا رَزَقْتَهُمْ، وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ»[1].

عەبدوڵڵای کوڕی بوسری سولەمی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای باوکم دابەزی و مەنزڵگای دانا، ئەویش خواردنی (حَيْس) و (سَوِيق) و خورمای بۆ هێنا، پاشان ئاوی بۆی هێنا، ئەویش لێی خواردەوە ئەوەی لێی مایەوە دایە ئەو کەسەی لای ڕاستی بوو، دەڵێ: خورماکەی دەخوارد و ناوکەکەشی دەخستە سەر پەنجەی شایەتمانی و پەنجەی تەنیشتی پاشان فڕێی دەدا، پاشان نزای بۆ کردن، فەرمووی: خوایە بەرەکەت بخە ئەوەی پێت داون، لێیان خۆشبە و بەزەییت پێیاندا بێتەوە.

## چوون بۆ داوەتی خواردن و سەردانی نەخۆش

٨٦١- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فُكُّوا الْعَانِيَ، وَأَجِيبُوا الدَّاعِيَ، وَعُودُوا الْمَرِيضَ»[2].

ئەبو مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەندکراو ئازاد بکەن، وەڵامی کەسێک بدەنەوە کە دەعوەتتان دەکات، سەردانی نەخۆش بکەن.

## گۆڕینەوەی دیاری خۆشەویستی قووڵتر دەکات

٨٦٢- عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ، وَيُثِيبُ عَلَيْهَا»[3].

---

(١) أخرجه مسلم: ٥٤٤٩.

(٢) أخرجه البخاري: ٤٨٧٩.

(٣) أخرجه البخاري: ٢٤٤٥.

دایکی بڕواداران عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دیاری وەردەگرت و پاداشتی خاوەنەکەشی دەدایەوە.

## ئیسلام ئایینی پاک و خاوێنی و جوانییە

٨٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ»، قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا، وَنَعْلُهُ حَسَنَةً؟! قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ، الْكِبْرُ: بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ»[1].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک بە ئەندازەی دەنکە گەردێک خۆ بە گەورە زانینی لە دڵدا بێ، ئەوە ناچێتە نێو بەهەشتەوە، پیاوێکیش گوتی: پیاوی وا هەیە حەز دەکات پۆشاکی چاک بن و، نەعل و پێڵاوی باش و جوان بن (ئایا ئەوەش خۆ بەگەورە زانیە؟) فەرمووی: خوا جوانە جوانیشی خۆشدەوێ، بەڵکو خۆبەگەورە زانین ئەوەیە: کەسێک هەق قبووڵ نەکات و خەڵکیش بە سووک و کەم تەماشا بکات.

## داواکردن بۆ جوانی ڕەوشت

٨٦٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَحْسَنْتَ خَلْقِي، فَأَحْسِنْ خُلُقِي»[2].

عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (لە کاتی چوونە بەرانبەر ئاوێنەدا) دەیفەرموو: خوایە وەک چۆن وا جوان دروستت کردووم، ڕەوشتیشم جوان بکە.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٧٥.

(٢) أخرجه أحمد: ٢٤٤٣٧، تعليق شُعيب الأرنؤوط: حديث صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين

## پارێزکردن لە خاوێن ڕاگرتنی پرچ و داهێنانی

٨٦٥- عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ لَهُ شَعْرٌ فَلْيُكْرِمْهُ»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پرچی هەبوو، با جوان خزمەتی بکات و ڕێزی بگرێ.

## لە پاڕانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ

٨٦٦- عَنْ زِيدِ بْنِ هَارُونَ، أَخْبَرَنَا أَبُو مَالِكٍ عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ وَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَقُولُ حِينَ أَسْأَلُ رَبِّي، قَالَ: «قُلِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي»، وَيَجْمَعُ أَصَابِعَهُ إِلاَّ الإِبْهَامَ: «فَإِنَّ هَؤُلاَءِ تَجْمَعُ لَكَ دُنْيَاكَ وَآخِرَتَكَ»[٢].

زەیدی کوڕی هاڕوون دەڵێ: ئەبو مالیک لە باوکیەوە ﷺ هەواڵی پێداین کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە، کاتێک پیاوێک هاتوتە لای و پرسیاری لێکردوە ئایا چی بڵێم کاتێک داوا لە پەروەردگارم دەکەم؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرموویەتی: خوایە لێم خۆشبە، ڕەحمم پێ بکە، لەش ساغم بکە، ڕزقم پێ ببەخشە، وە پەنجەکانی کۆکردنەوە جگە لە پەنجە گەورەی و فەرمووی: ئەو وشانە دونیاو دواڕۆژت بۆ کۆدەکەنەوە.

## بەڕاست دەستپێکردن لە شتە پاکەکان

٨٦٧- عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا لَبِسْتُمْ، وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ، فَابْدَؤُوا بِمَيَامِنِكُمْ»[٣].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پۆشاکتان پۆشی، یان دەستنوێژتان شۆرد، بە لای ڕاستە دەست پێبکەن.

---

(١) أخرجه أبو داود: ٤١٦٣، قال الحافظ في الفتح (٣٦٨/١٠) سنده حسن، والبيهقي في شعب الإيمان: ٦٤٥٥.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٦٩٧.

(٣) أخرجه ابن حبان: ١٠٩٠، قال شُعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

## پاڕانەوە بۆ لێخۆشبوون و لەش ساغبوون

٨٦٨- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «سَلُوا اللَّهَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ»[(١)].

ئەبو بەکری صیددیق ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: داوای لێخۆشبوون و لەش ساغی و سەلامەتی لە خوا بکەن.

## دوعای پێش چوونە ئاودەست

٨٦٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ، قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ»[(٢)].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێک دەیویست بچێت بۆ سەرئاو کردن، دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە نێرینە و مێینەی شەیتانەکان.

## ڕێگریکردن لە چپەچپکردن

٨٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ صَاحِبِهِمَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ»[(٣)].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ کەس بوون، با دووانیان جیا لەوەی دیکە چپەچپ نەکەن چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی خەفەتی پێ بخوات، وە گومانی لە دڵدا دروست بێ کە ڕەنگە باسی ئەو بکەن.

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧، والحميدي: ٢، والترمذي ٣٥٥٨، وقال: حسن غريب، والحاكم: ١٩٣٨، وقال: صحيح الإسناد.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٩٦٣.

(٣) أخرجه البخاري: ٥٩٣٢، ومسلم: ٢١٨٤، واللفظ لمسلم.

تێبینی: لە سێ حاڵەت ئەم چپە چپکردنە دروستە: (الصَدَقَة): دوو کەس پێکەوە ڕاوێژ بکەن، کە یارمەتی کەسێک بدەن هاوکاری ماددی بکەن، (الْمَعرُوف): یاخود چاکەیەکی مەعنەویی لەگەڵدا بکەن، یان ئامۆژگاری بکەن، یان لە هەڵەیەک بیگێڕنەوە. (الإصلاح) یاخود بۆ ئاشتەوایی و پێکهێنانەوەی خەڵک.

## وردبوونەوە و دڵنیابوونەوە لە هەواڵ

**٨٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِبَاً أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ کە بە هۆیەوە بە درۆزن دابنرێ، کە هەرچی بیستوویەتی بیگێڕێتەوە.

## حەرامی فێڵ کردن

**٨٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ أَصَابِعَهُ فِيهَا، فَإِذَا فِيهِ بَلَلٌ، فَقَالَ: مَا هَذَا يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ؟ قَالَ: أَصَابَتْهُ سَمَاءٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَهَلَّا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ، حَتَّى يَرَاهُ النَّاسُ، مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا»[٢].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە لای کۆمەڵێک خواردندا (کە دانرابوو بۆ فرۆشتن) پەنجەکانی خستنە نێویەوە، (سەرەوەی وشک بوو، بەڵام) لە ژێرەوە شێی تەڕی تێدابوو، فەرمووی: ئەوە چییە ئەی فرۆشیار؟ گوتی: بە هۆی بارانەوە وای بەسەر هاتووە، فەرمووی: ئەی بۆ نەتخستۆتە سەرەوە هەتا خەڵکی ببینن، هەرکەس فێڵ لە ئێمە بکات لە ئێمە نییە.

---

(١) أخرجه مسلم في مقدمة صحيحه: ٥.

(٢) أخرجه ابن حبان: ٤٩٠٥، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

## قەدەغەکردنی ترساندنی مسوڵمان

٨٧٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُمْ كَانُوا يَسِيرُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَسِيرٍ، فَنَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، فَانْطَلَقَ بَعْضُهُمْ إِلَى نَبْلٍ مَعَهُ، فَأَخَذَهَا، فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ الرَّجُلُ فَزِعَ، فَضَحِكَ الْقَوْمُ، فَقَالَ: مَا يُضْحِكُكُمْ؟ فَقَالُوا: لَا إِلَّا أَنَّا أَخَذْنَا نَبْلَ هَذَا فَفَزِعَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِماً"[١].

عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﷺ دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان گێڕاینەوە، کە ئەوان لە یەکێک لە سەفەرەکان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بوون، جا یەکێک لە پیاوەکان خەوی لێکەوت، تیرێکی لەلا بوو، یەکێکی تر لە هاوەڵان چوو تیرەکەی هەڵگرت و بردی (شاردیەوە)، جا کاتێک لە خەو هەڵسا، پەشۆکا، ئیدی خەڵکەکە هەموو پێکەنین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە چی پێدەکەنن، گوتیان: هیچ نییە، تەنها ئەوە بوو تیرێکی ئەومان بردو ئەویش پەشۆکا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دروست نییە و نابێ مسوڵمان مسوڵمانێکی دیکە بترسێنێ.

## سەرزەنشتکردنی قسە دابڕین لەگەڵ برای مسوڵمان

٨٧٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَاناً، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ»[٢].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکدی مەبوغزێنن، وە ئێرەیی بە یەکدی مەبەن، پشت لە یەکدی مەکەن، بەندەی خوابن، پێکەوە برابن، وە حەڵاڵ نییە بۆ هیچ مسوڵمانێک لە سێ شەو زیاتر قسە لەگەڵ برای مسوڵمانی نەکات.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٣١١٤، تعليق شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، وأبو داود: ٥٠٠٦.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٣٩٨ وصَحَّحَهُ الألباني.

## فەرمان بە سڵاو کردن

٨٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا لَقِيَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَإِنْ حَالَتْ بَيْنَهُمَا شَجَرَةٌ أَوْ جِدَارٌ، أَوْ حَجَرٌ، ثُمَّ لَقِيَهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ أَيْضاً»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە بە برای مسوڵمانی خۆی گەیشت با سڵاوی لێبکات، وە ئەگەر دارێک، یان دیوارێک، یان بەردێک کەوتە نێوانیان، پاشان پێی گەیشتەوە، با دیسان سڵاوی لێبکاتەوە.

## بە بەزەیی بە، بۆ هەموو کەس

٨٧٦- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: أَرْسَلَتِ ابْنَةُ النَّبِيِّ ﷺ إِلَيْهِ، إِنَّ ابْنًا لِي قُبِضَ فَأْتِنَا، فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلَامَ وَيَقُولُ: «إِنَّ للهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ» فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ، تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَيَأْتِيَنَّهَا؛ فَقَامَ وَمَعَهُ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَرِجَالٌ؛ فَرُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ كَأَنَّهَا شَنٌّ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا هذَا؟ فَقَالَ: «هذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللَّهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءُ»[٢].

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ، دەڵێ: کچێکی پێغەمبەر ﷺ لە دوای باوکی نارد، کەوا کوڕەکەم وا گیانی دەکێشرێ تەشریف بێنی بۆ لامان، پێغەمبەریش ﷺ یەکێکی ناردو فەرمووی: پێی بڵێ: ئەوەی خوا دەیدات دوایی دەیباتەوە ئەوە هەر هی خۆیەتی، هەموو شتێکیش لە لای خوا ماوەی دیاری کراوە، کەواتە: با ئارام بگرێ و چاوەڕێی پاداش بکات، بۆ جاری دووەم بە دوای بابی ناردوو سوێندیشی خوارد کە هەر دەبێ بچێتە لایان، پێغەمبەریش ﷺ هەڵسا لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەو موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابیت و چەند

---

(١) أخرجه أَبُو داود: ٥٢٠٢، أخرجه أَبُو داود: ٥٢٠٢، قال الألباني: صحيح موقوفا، مرفوعا.

(٢) أخرجه البخاري: ١٢٢٤، واللَّفْظُ لَهُ، ومسلم: ٢١٧٤.

پیاوێکی دیکە چوونە لای، کە منداڵەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕووحی دەداو هەناسەی تەنگ بوو بوو، وەک کوندەک (کوندە کە دۆی تێدەکرێ و دەهەژێ) فرمێسکیش لە هەردوو چاوە (گەش و جوان و موبارەکەکانی) پێغەمبەر ﷺ دەهاتنە خوارێ، سەعد ﷺ، گوتی: ئەم گریانە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟! فەرمووی: ئەوە سۆزو بەزەییە خوا دەیخاتە دڵی بەندەکانییەوە، وە بێگومان خوای گەورە بەزەیی دێتەوە بەو بەندانەی کە بە بەزەیین.

## سپاردە پارێزی لە سیفەتی بڕوادارییە

٨٧٧- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: مَا خَطَبَنَا نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ إِلاَّ قَالَ: «لاَ إِيْمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَهُ وَلاَ دِيْنَ لِمَنْ لاَ عَهْدَ لَهُ»[١].

ئەنەس ﷺ دەڵێ: هیچ جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری پێشکەش نەکردووین، مەگەر فەرموویەتی: بڕوای (تەواو) نییە، ئەو کەسەی سپاردە ناپارێزێ، وە دینداریی (تەواو) نییە ئەو کەسەی خاوەن بەڵێن و پەیمان نییە.

## لە ئادابەکانی لە پێکردنی پێڵاو

٨٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ، وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، لِتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ»[٢].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان پێڵاوی کردە پێی، با بە ڕاستە دەست پێبکات، وە ئەگەر پێڵاوی داکەند با بە چەپ دەست پێبکات، بۆ ئەوەی ڕاستە ببێتە یەکەم و داکەندران ببێتە کۆتایی.

---

(١) أخرجه أحمد: ١٢٤٠٦، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده حسن في الشواهد.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٥١٧، ومسلم: ٢٠٩٧.

## دوعای داواکردنی زانستی بە سوود

**٨٧٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمَاً نَافِعَاً، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ»[١].

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: خوایە من داوای زانست و زانیاری بە سوودت لێ دەکەم، وە پەنات پێ دەگرم لە زانستێک سوودی نەبێ.

## سووربوون لەسەر پاککردنەوەی دەم

**٨٨٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ»[٢].

عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سیواک پاککەرەوەیە بۆ دەم و، هۆکاری ڕەزامەندی پەروەردگارە.

## ئەزیەت نەدانی مسوڵمانان

**٨٨١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»[٣].

جابر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: مسوڵمان ئەو کەسەیە کە مسوڵمانان سەلامەت و پارێزراو بن لە زمان و دەستی.

---

(١) أخرجه ابن حبان: ٨٢، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، والطبراني في الأوسط: ٩٠٥٠، قال الهيثمي: (١٠/١٨٢): إسناده حسن.

(٢) أخرجه أحمد: ٢٤٢٤٩، والنسائي: ٥، وابن خزيمة: ١٣٥، وابن حبان: ١٠٦٧.

(٣) أخرجه مسلم: ١٧١.

## پەناگرتن بە خوا لە سیفەتە خراپەکان

**٨٨٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْهَرَمِ وَالْبُخْلِ، وَالْجُبْنِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَشَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[١].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێ توانایی و تەنبەڵی و پیریی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و سزای گۆڕو خراپەی مەسیحی دەجال.

## دوعایەک هیچ شتێک زیانی نابێ لەگەڵی

**٨٨٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لَقِيتُ مِنْ عَقْرَبٍ لَدَغَتْنِي الْبَارِحَةَ، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّكَ لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّكَ»[٢].

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا دوێنێ دووپشکێک پێوەی دام، فەرمووی: تۆ ئەگەر کاتێ ئێوارەت کردەوە بتگوتبایە: پەنا بە وشە تەواوەکانی خوا دەگرم لە خراپەی ئەوەی دروستی کردوە، هیچ شتێک زیانی بۆی نابێت.

## خەونی چاک و خەونی خراپ

**٨٨٤-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: كُنْتُ أَرَى الرُّؤْيَا، فَتُمْرِضُنِي حَتَّى سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ ﷺ يَقُولُ: كُنْتُ أَرَى الرُّؤْيَا، فَتُمْرِضُنِي حَتَّى سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ فَلْيَقُصَّهُ عَلَى مَنْ يُحِبُّ، وَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ، فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا، وَلْيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا»[٣].

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٦٦٨، ومسلم: ٢٧٠٦، وأبو داود: ١٥٤٠، والترمذي: ٣٤٨٥، وابن حبان: ١٠٠٩، واللفظ له.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٧٠٩.

(٣) أخرجه البخاري: ٥٤١٥، ومسلم: ٢٢٦١.

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: من خەونی (ی هێندە ناخۆش)ـم دەبینی نەخۆشی دەخستم، هەتا گوێم لە ئەبو قەتادە ﷺ بوو دەیگوت: منیش خەو (نی ناخۆش)ـم دەبینی نەخۆشی دەخستم، هەتا گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: خەونی چاک لە خواوەیە، ئەگەر یەکێک لە ئێوە خەونێکی بینی پێی خۆش بوو، با لەلای ئەو کەسە باسی بکات کە خۆشی دەوێ، وە ئەگەر یەکێک لە ئێوە خەوێکی بینی پێی ناخۆش بوو، با پەنا بگرێ بە خوا لە شەڕو خراپەی، هەروەها با سێ جار تف بکات بەلای چەپیدا.

## دوعای کاتی خەوتن و لە خەو هەڵسان

٨٨٥- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ قَالَ: «بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ أَمُوتُ وَأَحْيَا»، وَإِذَا اسْتَيْقَظَ مِنْ مَنَامِهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[1].

حوزەیفە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیویستایە بخەوێ دەیفەرموو: خوایە بە ناوی تۆوە دەمرم و زیندوو دەبمەوە (لێرەدا مەبەست بە مردن نووستنە، چونکە نووستن برای مردنە)[2]، وە کاتێ لە خەو هەڵسابا دەیفەرموو: ستاییش بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە دوای ئەوەی مراندمانی، زیندووبوونەوەو گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای ئەوە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٩٦٥.

(٢) النَّوْمُ أَخُو المَوْتِ، ولَا يَمُوتُ أَهْل الجَنَّةِ رَواهُ الدَيْلَمي: ٦٩٠٧ ، وصَحَّحَهُ الألباني، واتە: نووستن برای مردنە و، خەڵکی بەهەشتیش نامرن.

## له ئادابەکانی باوێشک

٨٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَرُدَّ مَا اسْتَطَاعَ، وَلَا يَقُلْ: هَاوْ، فَإِنَّهُ إِذَا، قَالَ: هَاوْ، ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ، فَإِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ، فقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ فَحَقٌّ عَلَى مَنْ سَمِعَهُ أَنْ يَقُولَ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ»(١).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا پژمینی خۆش دەوێ، وە ڕقی لە باوێشکە، ئەگەر یەکێک لە ئێوە، باوێشکی هات با بەپێی توانا بیگێڕێتەوە، وە با نەڵێ: ها، (باوێشک بدات و دەمی بکاتەوە) چونکە ئەگەر وتی: ها، شەیتان پێی پێدەکەنێ، جا ئەگەر یەکێک لە ئێوە پژمی و وتی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ) واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوا، ئەوە حەقە لەسەر ئەو کەسەی کە گوێی لێ بووە بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) واتە: خوا ڕەحمت پێ بکات.

## پاداشتی نوێژی بەیانی

٨٨٧- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، قَالَ: دَخَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ الْمَسْجِدَ بَعْدَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ، فَقَعَدَ وَحْدَهُ، فَقَعَدْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ، يَا ابْنَ أَخِي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ»(٢).

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو عەمرە دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دوای نوێژی مەغریب چووە نێو مزگەوت، بە تەنیا دانیشت، منیش لەلای دانیشتم، (عوسمان ﷺ) گوتی: ئەی کوڕی برام! گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس نوێژی عیشا بە کۆمەڵ بکات، وەک ئەوە وایە تا نیوەی شەو شەونوێژی

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٦٩.

(٢) أخرجه مسلم: ٦٥٦.

کردبێ، وە هەر کەسێک نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات وەک ئەوە وایە هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێ.

## ئیسلام، ئیمان، ئیحسان، دووڕوویی، هاوبەشدانان، ڕووپامایی.

### پێناسەی ئیسلام

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

٨٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بُنِيَ الإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدَاً رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ»[١].

ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزرێنراوە: شایەتمان بەوە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی دیکە (بە هەق) نییە، موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەنجامدانی پێنج نوێژ (لە ڕۆژێکدا)، زەکات دەرکردن لە ماڵ و سامان، حەجی ماڵی خوا (ئەگەر توانا هەبوو)، ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان.

### پێناسەی ئیمان

٨٨٩- عَنْ عُمَر بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الإِيْمَانُ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»[٢].

عومەر کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمان بریتیە لەوەی کە: بڕوات هەبێ بە خوا، بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرەکانی خوا، بە ڕۆژی دوایی، وە بڕوات هەبێ بە قەدەری خوا بە چاک و بە خراپییەوە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٨، ومسلم: ١٦.

(٢) أخرجه مسلم: ١٥١.

## پێناسەی ئیحسان

٨٩٠- عَنْ عُمَر بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الإِحْسَانُ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ»(١).

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیحسان (کە پلەی هەرە بەرزی دینداریيە) بریتیە لەوەی کە: بە جۆرێک خوا بپەرستی وەک ئەوەی چاوت خوا ببینێ، خۆ ئەگەر تۆش خوا نەبینی، دڵنیا بیت ئەو دەتبینێ.

## پێناسەی دووڕوویی

٨٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ»(٢).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چوار سیفەت لە هەر کەسێکدا هەبن، ئەوە مونافیقێکی تەواوە، وە هەر کەسێک یەک لەو چوار سیفەتەی تێدا هەبن، ئەوە سیفەتێک لە سیفەتەکانی نیفاقی تێدان، تاکو دەستی لێ هەڵدەگرێ (کە بریتین لەمانە): هەر کاتێ بە ئەمیندار دانرا خیانەت بکات، وە هەمیشە لە کاتی قسەکردن درۆ بکات، وە هەردەم لە کاتی پەیماندان غەدر بکات و پەیمان بشکێنێ، وە هەر کاتێ دەمەقاڵێ و مشت و مڕی بوو، خۆی تووشی گوناهو تاوان بکات.

---

(١) أخرجه مسلم: ١٥١.

(٢) أخرجه البخاري: ٣٤، ومسلم: ٥٨.

## پێناسەی هاوبەش دانان

٨٩٢- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْمُوجِبَتَانِ؟ قَالَ: «مَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئاً دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ دَخَلَ النَّارَ»[1].

جابر ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوو پێویستکەرەکان (کە چوونە بەهەشت و دۆزەخ واجب دەکەن) چین؟ فەرمووی: هەر کەسێک بمرێ و هاوبەشی بۆ خوا دانەنابێ، دەچێتە بەهەشتەوە، هەر کەسێکیش بمرێ و هاوبەشی بۆ خوا دانابێ، دەچێتە دۆزەخەوە.

## پێناسەی ڕووپامایی[2]

٨٩٣- عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ؟ قَالَ: «الرِّيَاءُ إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: يَوْمَ تُجَازَى الْعِبَادُ بِأَعْمَالِهِمْ اذْهَبُوا إِلَى الَّذِينَ كُنْتُمْ تُرَاءُونَ بِأَعْمَالِكُمْ فِي الدُّنْيَا، فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ جَزَاءً»[3].

مەحموودی کوڕی لەبید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شتێک کە زۆر مەترسیم لێی هەیە بەرانبەرتان شیرکی بچووکە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! شیرکی بچووک چییە؟ فەرمووی: ڕووپامایی، (ئەوەیە شتێک بکەی بەشی غەیری خوای تێبخەی). جا خوا لەو ڕۆژەی پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە (بە ڕیابازان) دەفەرموێ: بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی ئێوە ڕیابازیتان لە پێناو دەکردن و کردەوە چاکەکانتان بۆ ئەوان ئەنجامدەدا لە دونیا، بزانن هیچ پاداشتتان لەلای ئەوان دەست دەکەوێ؟

---

(١) أخرجه أحمد: ١٥٢٣٧، قال شُعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، وهذا إسناد قوي على شرط مسلم.

(٢) هاوبەشدانانی بچوک، ڕیابازی

(٣) أخرجه أحمد: ٢٣٦٨٦، وقال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

## بەشی دووەم

لەم بەشەدا، بە گشتی تیشک دەخەینە سەر پێگە و پلە و ڕێزی ئافرەت لە ئیسلامدا، وەک: دایک، هاوسەر (خێزان)، کچ، خوشک، وە هەروەها هێنانەوەی چەند وێنەیەک لە فەرموودە شیرین و بەڕێزەکانی خۆشەویستی خوا ﷺ، کەتیایاندا چارەسەری دەیان کێشە و گرفتی نێو کۆمەڵگەی تێدا بەدی دەکرێ.

### وەک دایک

٨٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أَبَاكَ»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوترا: (واتە: یەکێک گوتی:) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کێ زۆر چاکەکار بم؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: باوکت. (کەواتە: دایک سێ پلە لە پێش باوکەوەیە بۆ چاکە لەگەڵ کردن).

٨٩٥- عَنْ أَسْمَاءِ ﷺ قَالَتْ: أَتَتْنِي أُمِّي رَاغِبَةً، فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: أَصِلُهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ»[٢].

ئەسماء ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دایکم (هاوبەشدانەر بوو) هاتە لام، پێی خۆشبوو پەیوەندی هەبێ لەگەڵم، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر کرد، ئایا (چاکە بکەم لەگەڵی و) پەیوەندیم هەبێ لەگەڵی؟ فەرمووی: بەڵێ (چاکەکاربە لەگەڵی و پەیوەندی لەگەڵ مەپچڕێنە).

---

(١) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٥، والحديث في الصحيحين بلفظ من أحق الناس بحسن صحابتي الحديث.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٦٣٣، ومسلم: ٢٣٧١.

٨٩٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِـمْتُ، فَرَأَيْتُنِي فِي الجَنَّةِ، فَسَمِعْتُ صَوْتَ قَارِئٍ يَقْرَأُ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا حَارِثَةُ بْنُ النُّعْمَانِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَذَلِكَ الْبِرُّ، كَذَلِكَ الْبِرُّ»، قَالَتْ: وَكَانَ أَبَرَّ النَّاسِ بِأُمِّهِ[1].

عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خەوتم، خۆم بینی وا لە بەھەشتم، گوێم لە دەنگێک بوو، قورئانی دەخوێند، گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتیان: ئەوە حاریسەی کوڕی نوعمانە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئا ئەوەیە پاداشتی چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک، (عائیشە ﵂ دەڵێ:) ئەو ھاوەڵە بەڕێزە باشترینی خەڵکی بووە لەگەڵ دایکی.

٨٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَغِمَ أَنْفُهُ، رَغِمَ أَنْفُهُ، رَغِمَ أَنْفُهُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ؟ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ عِنْدَ الْكِبْرِ، أَوْ أَحَدَهُمَا، فَدَخَلَ النَّارَ»[2].

ئەبو ھورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لووتی بە خۆڵدا بچێ، لووتی بە خۆڵدا بچێ، لووتی بە خۆڵدا بچێ! گوتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەو کەسەی بە دایک و باوکی، یان بە یەکێکیان ڕادەگات لە کاتی پیری و بە تەمەنی، کەچی دەچێتە دۆزەخیشەوە (واتە: بای ئەوەندە خزمەتی نەکردبن کە پێی بچێتە بەھەشت).

٨٩٨ «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: زَارَ النَّبِيُّ ﷺ قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ»[3].

ئەبو ھورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی کرد، گریا، جا ئەو خەڵکەی دەوروبەری ھەموو گریاند (واتە: بە ھۆی گریانی ئەوەوە ﷺ، ھەموو گریان).

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٥٣٧٦، والنسائي: ٨٢٣٤، وقال شُعيب الأرناؤوط في المسند: إسناده صحيح.

(٢) أخرجه مُسلم: ٢٥٥١، واللفظ للبخاري في الأدب المفرد: ٢١.

(٣) أخرجه مُسلم: ٩٧٦، وابن حبان: ٣١٦٩.

٨٩٩- عَنِ اَلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْخَالَـةُ بِـمَنْزِلَةِ الْأُمِّ»[١].

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوشکی دایک لە شوێنی دایکە.

## وەک هاوسەر (ژن، خێزان)

٩٠٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا ذَبَحَ الشَّاةَ، فَيَقُولُ: «أَرْسِلُوا بِهَا إِلَى أَصْدِقَاءِ خَدِيجَةَ»[٢].

دایکمان عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو کە مەڕێکی سەردەبڕی، بەش بەشی دەکرد و دەیفەرموو: بینێرن بۆ دۆستەکانی خەدیجە (وەک وەفا و ڕێز و خۆشەویستی بۆ خەدیجە ﷺ).

٩٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَكْمَلَ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا، وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِكُمْ»[٣].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئیمان تەواوترینی بڕواداران ڕەوشت جوانترینیانە، وە باشترینتان باشترینتانن بۆ ژنەکانتان (هاوسەرانتان).

٩٠٢- عَنْ جَابِرٍ ﷺ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ»[٤].

جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەربارەی ژنان لە خوا بترسن، چونکە ئێوە ئەوانتان وەرگرتوە وەک ئەمانەتی خوا، وە داوێنیانتان بۆ خۆتان حەڵاڵ کردوە بە وشەی خوا (کە بریتیە لە -إنكاح و تزويج-).

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٥٥٢، والترمذي ١٩٠٤، وابن حبان: ٤٨٧٣

(٢) أخرجه البخاري: ٣٨٢١، ومسلم: ٦٤٣١.

(٣) أخرجه أحمد: ١٠١١٠، وقال شُعيب الأرنؤوط: حديث صَحِيح.

(٤) أخرجه مسلم: ١٢١٨، وابن حبان: ١٤٥٧.

٩٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْراً»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئامۆژگارییتان دەکەم) ئامۆژگاری یەکتری بکەن دەربارەی ئافرەتان بە چاکە (واتە: بە چاکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن).

٩٠٤- عَنِ الْعِرْبَاضِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا سَقَى امْرَأَتَهُ مِنَ المَاءِ أُجِرَ»، فَأَتَيْتُ امْرَأَتِي فَسَقَيْتُهَا، وَحَدَّثْتُهَا بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٢].

عیرباض ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: ئەگەر پیاو ئاو بداتە ژنەکەی، پاداشتی دەدرێتەوە، (جا دەڵێ:) چوومەوە بۆ لای ژنەکەم و ئاوم پێدا، وە ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستبووم، بۆم باسکرد.

٩٠٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا غَيرَ مُفْسِدَةٍ، كَانَ لَهَا أَجْرُهَا، وَلَهُ مِثْلُهُ بِمَا اكْتَسَبَ، وَلَهَا بِمَا أَنْفَقَتْ»[٣].

عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ژن لە ماڵ و سامانی مێردەکەی خەرج بکات (بەشێکی لێ بکاتە خێر)، بێ ئەوەی زێدەڕۆیی تێدا بکات، ئەوە پاداشتی بۆ هەیە، هەروەها پاداشت بۆ مێردەکەشی دەنووسرێ، چونکە ئەو پەیدای کردوە، ژنەکەش بەخشیوەیەتی.

٩٠٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ ﷺ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمُ الْغَيْبَةَ، فَلاَ يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلاً»[٤].

---

(١) أخرجه البخاري: ٣١٥٣، ومسلم: ١٤٦٨.

(٢) أخرجه أحمد: ١٧١٩٥، قال شُعيب الأرنؤوط: صحيح بِشَواهِدِهِ.

(٣) أخرجه البخاري: ١٣٥٩، ومسلم: ١٠٢٤، واللَّفْظ لِمسلم.

(٤) أخرجه البخاري: ٤٩٤٦، ومسلم: ٧١٥

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە لە سەفەرێکیدا زۆری پێچوو، بە شەو (گەڕایەوە) با لە ناکاو نەچێتە ژوورەوە بۆ لای خانەوادەکەی.

٩٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَجْلِدُ أَحَدُكُمْ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ، ثُمَّ يُجَامِعُهَا فِي آخِرِ الْيَوْمِ»[١].

عەبدوڵلای کوڕی زەمعە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێکتان لە ژنەکەی نەدات وەک لێدانی کۆیلە، پاشانیش بچێ لە کۆتایی ڕۆژەکەدا لەگەڵی جووت بێ. (فەرمانی کردوە بە هەڵسوکەوتی جوان و سۆزداری لەگەڵیان).

٩٠٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَحَدَا الْحَادِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَيْحَكَ يَا أَنْجَشَةُ! رُوَيْدَكَ بِالْقَوَارِيرِ»[٢].

ئەنەس ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێکدا بوو، وشترەوانەکەش وشترەکانی خستبووە پێشی خۆی و گۆرانی دەگوت تاکو هانیان بدات لەسەر ڕۆیشتن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەی ئەنجەشە! لەسەرخۆ و هێواش بە لەگەڵ شووشەکان (واتە: لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی سواری پشتی وشترەکان بوون)!

٩٠٩ «عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: سَابَقَنِي النَّبِيُّ ﷺ فَسَبَقْتُهُ، فَلَبِثْنَا حَتَّى إِذَا أَرْهَقَنِي اللَّحْمُ سَابَقَنِي فَسَبَقَنِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَذِهِ بِتِلْكَ»[٣].

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٩٠٨.

(٢) أخرجه البخاري: ٦٢٠٩، ومسلم: ٢٣٢٣.

(٣) أخرجه أحمد: ٢٤١٦٤، وابن حبان: ٤٦٩١، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشبڕکێی لەگەڵ کردم، منیش پێشی کەوتم (لێم بردەوە)، پاشان بەو شێوە ماینەوە هەتا (ماوەیەک، دواتر کە من قەڵە و بووم) قەڵەوی ماندووی کردم، ئینجا پێشبڕکێی لەگەڵ کردم و پێشمکەوتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە بە ئەوە (واتە: جارێک تۆ لە منت بردەوە و پێشمکەوتی، جارێکیش من تۆڵەی خۆم کردەوە و پێشتکەوتمەوە).

## وەک کچ

کچان گوڵی نێو ماڵن، بەرەکەتی خێزانن، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر منداڵی خۆشویستوون و ڕێزی گرتوون، بە تایبەت کچەکانی بێ جیاوازی، وە بە شێوەی کرداری پیشانی عەڕەبی داوە، ئەو تێگەیشتنەیان هەڵەیە کە خراپ مامەڵە کردن و بە سووک سەیرکردنی ئافرەتە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**٩١٠- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَكْرَهُوا الْبَنَاتِ، فَإِنَّهُنَّ الْمُؤْنِسَاتُ الْغَالِيَاتُ»[1].**

عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕقتان لە کچان نەبێتەوە (خۆشتان بوێن)، چونکە کچەکان دڵخۆشکەری (خێزان و خانەوادەن) و ڕێزدار و بەهادارن.

**٩١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: «أَنْ تَسْكُتَ»[2].**

ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کچ مارە ناکرێ تا مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەت لێوەرگرتنی چۆنە؟ فەرمووی: بێدەنگ بوونیەتی، (چونکە جاری وایە کچ شەرم دەکات بڵێ: دەمەوێ شوو بە فڵان کەس بکەم).

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧٣٧٣، والطبراني في الكبير: ٨٥٦، قال الهيثمي (١٥٦/٨): فيه ابن لهيعة، وحديثه حسن، وبقية رجاله ثقات، انظر الصَّحِيحَة: ٣٢٠٦ للألباني.

(٢) أخرجه البخاري: ٤٨٤٣، ومسلم: ١٤١٩.

٩١٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ»، وَضَمَّ أَصَابِعَهُ[1].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو کچ بە خێو بکات هەتا باڵغ دەبن، لە ڕۆژی قیامەت کە دێت من و ئەو ئاواین، (پەنجەکانی هێنایە تەنیشت یەکتر)!

## وەک خوشک

٩١٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُولُ ثَلَاثَ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلَاثَ أَخَوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ»[2].

عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک نییە لە ئوممەتی من سێ کچ، یان سێ خوشک بە خێو بکات، وە چاکەکار بێ لەگەڵیان، ئەوە بە دڵنیایی بۆی دەبنە پارێزەرو دەیپارێزن لە ئاگر (ی دۆزەخ).

## گرنگی پێدان و ئامۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بۆ ئافرەتان

٩١٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ وَمَعَهُ بِلَالٌ، فَظَنَّ أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعْ فَوَعَظَهُنَّ، وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتْ الْمَرْأَةُ تُلْقِي الْقُرْطَ وَالْخَاتَمَ، وَبِلَالٌ يَأْخُذُ فِي طَرَفِ ثَوْبِهِ[3].

ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بیلالی لەگەڵ بوو چوو بۆ (لای ئافرەتان لە مزگەوت چونکە)، پێی وابوو کە گوێبیستی (وتارەکەی) نەبوون، بۆیە ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێکردن بە ماڵ بەخشین، جا هەر ئافرەتەو گوارەو ئەنگوستیلەی خۆی فڕێ دەدا (بۆ کۆشی بیلال) بیلالیش کۆشی بۆ گرتبوونەوە.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٦٣١.

(٢) أخرجه البَيْهَقِيُّ في شعب: ١١٠٢٣، وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع: ٥٣٧٢.

(٣) أخرجه البخاري: ٩٨، ومسلم: ٨٨٤.

٩١٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ: قَالَتِ النِّسَاءُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: غَلَبَنَا عَلَيْكَ الرِّجَالُ، فَاجْعَلْ لَنَا يَوْمَاً مِنْ نَفْسِكَ. فَوَعَدَهُنَّ يَوْمَاً لَقِيَهُنَّ فِيهِ، فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُن، فَكَانَ فِيمَا قَالَ لَهُنَّ: «مَا مِنْكُنَّ امْرَأَة تُقَدِّمُ ثَلَاثَةً مِنْ وَلَدِهَا إِلَّا كَانَ لَهَا حِجَابًا مِنَ النَّارِ». فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: وَاثْنَتَيْنِ؟ فَقَالَ: «وَاثْنَتَيْنِ»[1].

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ، دەڵێ: ئافرەتان بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: پیاوان زاڵن بەسەر ئێمەو دەفەرت نادەن ببینە خزمەتت (بۆ فێربوون)، جا ڕۆژێکمان بۆ دابنێ ببینە خزمەتت، (پێغەمبەریش ﷺ) بەڵێنی ڕۆژێکی پێدان و لەو ڕۆژەدا پێیانگەشت، جا (چی پێویست بوو بۆی باسکردن و) ئامۆژگاری کردن، فەرمانی پێکردن، جا لەو ئامۆژگارییانەی بۆی کردن ئەوەبوو کە پێی فەرموون: هەر ئافرەتێک لە ئێوە سێ منداڵی پێش خۆی بمرێ، بۆی دەبنە پەرژین لە ئاگری دۆزەخ، ئافرەتێکیش گوتی: ئەگەر دوو منداڵیشی بمرێ؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ) دووانیش.

٩١٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً كَانَ فِي عَقْلِهَا شَيْءٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أُمَّ فُلَانٍ، خُذِي أَيَّ الطُّرُقِ شِئْتِ، فَقُومِي فِيهِ حَتَّى أَقُومَ مَعَكِ»، فَخَلَا مَعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنَاجِيهَا حَتَّى قَضَتْ حَاجَتَهَا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ[2].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک هەبوو عەقڵی ناتەواو بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کارێکم بە تۆ هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی دایکی فڵان بە ویستی خۆت کام ڕێگەو جێگەت پێ خۆشە هەڵبژێرە (با قسە بکەین، فەرموو) هەڵسە هەتا لەگەڵت بێم، پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەنها گفتوگۆی لەگەڵ کرد، هەتا ئافرەتەکە پێویستیەکەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ تەواو کرد.

---

(١) أخرجه البخاري: ١٠١، ومسلم: ٢٦٣٣.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٣٢٦، وأبو داود: ٤٨١٨، وابن حبان: ٤٥٢٧.

٩١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سبحان الله) بۆ پیاوانە، چەپڵە لێدانیش بۆ ئافرەتانە. (واتە: بە لەپی دەستی ڕاستی بدات لە پشتی دەستی چەپی لە کاتێک ئیمام هەڵە دەکات، یاخود شتێکی نامۆ دەبینن لە نوێژدا، بە مەبەستی ئاگادار کردنەوە).

٩١٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلاَ الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ وَلاَ يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَلاَ تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ»[٢].

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نابێ پیاو سەیری عەورەتی پیاو بکات، وە نابێ ئافرەت سەیری عەورەتی ئافرەت بکات، وە نابێ پیاو لەگەڵ پیاو لە ژێر پارچە قوماشێکدا بخەوێ، وە نابێ ئافرەت لەگەڵ ئافرەت لە ژێر پارچە قوماشێکدا بخەوێ.

## بەشی سێیەم

ڕێژەی جیابوونەوە لە هیچ ڕۆژگارێکدا وەک ئێستا زۆر نەبووە، هۆکار زۆرن، بەڵام هۆکاری سەرەکی دووری خەڵکە بە گشتی، کچان و کوڕانمان بە تایبەتی لە پابەندییان بە شەریعەتی ئیسلام و ڕەچاوکردنی ڕێنماییەکانی، کە پاکترین و چاکترین پەیامی پەروەرێنە سبحانە وتعالی بۆ تێکڕای دروستکراوان، بە تایبەت ئەوانەی (مکلف)ن بە پابەندی و دەست پێوەگرتنی.

هەوڵمداوە لەم چەند لاپەڕە تیشکێک بخەمە سەر ئەو قۆناغە هەستیارەی پێش پرۆسەی هاوسەرگیری، وە لە ژێر ڕۆشنایی فەرموودەکانی خۆشەویست ﷺ باسی هەندێک لەو ڕێنماییانە بکەین، چونکە سەرووی (٧٠٪)ـی جیابوونەوە و تەڵاق

(١) أخرجه البخاري: ١١٤٥، ومسلم: ٤٢٢.

(٢) أخرجه مسلم: ٣٨٨.

لەم قۆناغە هەستیارە ڕوودەدات، دەتوانم بڵێم: شەیتان لە هیچ قۆناغێکی دیکەی ژیانی مرۆڤ، هێندە هەوڵ نادات و کاریگەری لەسەر مرۆڤ دروست ناکات، بۆ بە لاڕێدابردن و سەر لێشێواندنی.

## نیاز و مەبەست بنچینە و بنەمای هەموو کارێکە

**٩١٩-** عَنْ عُمَر بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، إِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[1].

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان (وەرگیرانی) کردەوەکان بە پێی نیازەکانە، وە هەر کەسێک بە پێی نیازەکەی پاداشت دەدرێتەوە، جا هەرکەس کۆچکردنی بۆ بەدەستهێنانی (دەستکەوتێکی) دونیایی بێ، یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێک بێ، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردوە.

**٩٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُعِينَهُمُ: الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالنَّاكِحُ يُرِيدُ أَنْ يَسْتَعِفَّ، وَالْمُكَاتَبُ يُرِيدُ الْأَدَاءَ»[2].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا لەسەر خۆی پێویست کردوە یارمەتی سێ کەس بدات: ئەو کەسەی لە پێناوی خوا تێدەکۆشێ، ئەو کەسەی هاوسەرگیری دەکات بە نیازی داوێنپاکی، ئەو کۆیلەی گرێبەستی کردوە لەگەڵ گەورەکەی بۆ ئەوەی پارەکەی بداتەوە و خۆی ئازاد بکات.

---

(١) أخرجه البخاري: ١، ومسلم: ٤٩٠٤.

(٢) أخرجه أحمد: ٩٦٢٩، والترمذي: ١٦٥٥، وقال: حسن، والنسائي: ٣١٢٠، وابن ماجه: ٢٥١٨، والحاكم: ٢٨٥٩، وقال: صحيح على شرط مسلم، وابن حبان: ٤٠٣٠.

## پشت بەستن بە خوا لە هەموو کارێکدا

٩٢١- عَنْ عُمَر بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ، تَغْدُو خِمَاصاً، وَتَرُوحُ بِطَانًا»[1].

عومەر کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەڕاستی و تەواوی پشت بە خوا ببەستن، ڕۆزیتان دەدات، وەک چۆن ڕۆزی باڵندە دەدات، بەیانیان بە سکی برسیەوە دەچێتەدەر (لە هێلانەکەی)، ئێوارانیش بە سکی پڕ دەگەڕێتەوە.

## چارەسەری خۆشەویستی نێوان کوڕ و کچ

٩٢٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَمْ نَرَ لِلْمُتَحَابَّيْـنِ مِثْلَ النِّكَاحِ»[2].

ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ چارەسەرێک نابینین باشتر بێ لە هاوسەرگیری بۆ دوو کەس کە یەکتریان خۆشبوێ.

## هاندان بۆ ئەنجامدانی هاوسەرگیری

٩٢٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ»[3].

ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەر کەس لە ئێوە توانای هەیە با ژن بێنێ.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٠٥، والترمذي: ٢٣٤٤، وقال: حسن صحيح، والحاكم: ٧٨٩٤، قال: صحيح الإسناد.

(٢) أخرجه ابن ماجه: ١٨٤٧، والطبراني في الكبير: ١٠٨٩٥، والحاكم: ٢٦٧٧، وقال: صحيح على شرط مسلم، والبيهقي في الكبرى: ١٣٢٣، وصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه البخاري: ١٩٠٥.

## هاوسەرگیری نیوەی ئایین تەواو دەکات

**٩٢٤- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَزَوَّجَ العَبْدُ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ نِصْفَ الدِّينِ، فَلْيَتَّقِ اللّه فِي النِّصْفِ البَاقِي»**[1].

ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک بەندە (کوڕ، یان کچ) هاوسەرگیری کرد، ئەوە بە دڵنیایی نیوەی دینداریيەکەی تەواو بووە، دەی با پارێز لە خوا بکات لەو نیوەی دیکەی کە ماوە.

## بەرەکەت لە ئاسانکردنی مارەییدایە

**٩٢٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنْ يُمْنِ الْمَرْأَةِ تَسْهِيلُ أَمْرِهَا، وَقِلَّةُ صَدَاقِهَا»**[2].

عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: لە بەرەکەتداری هاوسەرگیری ئافرەت ئەوەیە کارئاسانی بکرێ لە بە شوودان و مارەییەکەشی کەم بێت.

**٩٢٦- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجَ عَلِيٌّ فَاطِمَةَ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَعْطِهَا شَيْئًا، قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ، قَالَ: فَأَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ»**[3].

ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێک عەلی فاطیمەی ﷺ مارە کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شتێکی پێ بدە (وەک مارەیی)، گوتی: هیچم نییە، فەرمووی: ئەی قەڵغانە حوطەمییەکەت لە کوێیە؟ (لە شوێنی دیکە هاتوە: وتی: لەلامە، فەرمووی: پێی بدە).

---

(١) أخرجه البَيْهَقِي في شعب الإيمان: ٥٤٨٦، وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع: ٤٣٠.

(٢) أخرجه ابن حبان: ٤٠٩٥، وحَسَّنَهُ كُلّ مِنَ الألباني وشُعيب الأرنؤوط.

(٣) أخرجه ابن حبان: ٦٩٤٥، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

## سەیرکردنی ئافرەت لە کاتی داخوازی

٩٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ، فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا»؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: «فَاذْهَبْ، فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الأَنْصَارِ شَيْئًا»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە لای پێغەمبەر ﷺ بووم، پیاوێک هاتە لای، هەواڵی پێدا کە ئافرەتێکی ئەنصاری خواستوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا سەیرت کردوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: بڕۆ، سەیری بکە، چونکە لە چاوی ئەنصارییەکان شتێک هەیە!

## لە حیکمەتەکانی سەرپەرشتیکردنی ئافرەت بۆ بە شوودان

٩٢٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ، وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ»[2].

عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مارەیی دروست نییە بەبێ سەرپەشتیاری (کچەکە) و دوو شاهێدی دادگەر.

## چ کوڕێک شایستەیە مێردی پێ بکەی

٩٢٩- عَنْ أَبِي حَاتِمٍ الْمُزَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَإِنْ كَانَ فِيهِ، قَالَ: «إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٨٤٨. (قال النووي ﷺ قِيلَ: الْمُرَاد صِغَر، وقِيلَ زُرْقَة) انظر: المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، دار إحياء التراث العربي، بيروت، الطبعة الثانية: ١٣٩٢. ج١٠، ص٢١٠.

(٢) أخرجه ابن حبان: ٤٠٧٥، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

(٣) أخرجه الترمذي: ١٠٨٥، قال: هَذَا حديث حسن غريب.

ئەبو حاتەمی موزەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ کەسێک هاتە لاتان داوای کچەکەتانی کرد ئەگەر لە دینداریی و ڕەوشتەکەی ڕازی بوون، ئەوە کچەکەتانی پێبدەن، ئەگەر ئەم کارە نەکەن ئەوە خراپەکاریی و ئاشووب لەسەر زەوی بڵاو دەبێتەوەو خراپەیەکی زۆر دێتە کایەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەگەر ماڵی کەم بوو، یان توانای کەم بوو، فەرمووی: هەر کاتێ کەسێک هاتە لاتان داوای کچەکەتانی کرد ئەگەر لە دینداریی و ڕەوشتەکەی ڕازی بوون، ئەوە کچەکەتانی پێبدەن، سێ جاران ئەمەی دووبارە کردەوە.

## نابێ بەزۆر (تۆبزی) کچ بە شوو بدرێ

٩٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ جَارِيَةً بِكْرًا أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَتْ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا النَّبِيِّ ﷺ»[١].

ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کچێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ باسی کرد کە باوکی بە شووی داوە، ئەویش پێی ناخۆشە (هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسە بکات کە باوکی پێیداوە)، پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کرد (دەتەوێ بەردەوام بە، ناتەوێ هەڵیدەوەشێنینەوە).

## پرۆسەی هاوسەرگیری پێویستە ئاشکرا بکرێ

٩٣١- عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ اَلزُّبَيْرِ- عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعْلِنُوا النِّكَاحَ»[٢].

عامڕی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوسەرگیری ئاشکرا بکەن.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٠٩٦، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري.

(٢) أخرجه أحمد: ١٦١٧٥، وابن حبان: ٤٠٦٦، والحَاكِمُ: ٢٧٤٨، وقال الحاكم: صحيح الإسناد، ووافقه الذهبي، وقال محقق المستدرك د. محمد كامل: إسناده حسن.

## پۆشتەیی ئافرەتان (حیجاب)

٩٣٢- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄، دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهَا ثِيَابٌ رِقَاقٌ، فَأَعْرَضَ- عَنْهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ لَهَا: «يَا أَسْمَاءُ! إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ، لَمْ يَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلَّا هَذَا»، وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ[1].

عائیشە دەڵێ: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پۆشاکێکی تەنکی لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا و پێی فەرموو: «ئەی ئەسماء! ئافرەت دوای ئەوەی باڵغ دەبێ، ناگونجێ هیچ شوێنێکی لاشەی ببینرێ جگە لەوە»، ئاماژەی کرد بۆ ڕوخسارو هەردوو لەپی دەستی.

## بەشی چوارەم

## پیاوان و ئافرەتان بنەمای مرۆڤایەتین

٩٣٣- عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ بِنْتِ مِلْحَانَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ»[2].

ئوممو سولەیمی کچی میلحان ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتان هاوتای پیاوانن.

## ژن و مێرد نابێ بیانوو بگرن بە یەکتر

٩٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً، إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقَاً رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ»[3].

---

(١) أخرجه أبو داود: ٤١٠٤، والبيهقي في شعب الإيمان: ٧٤٠٩، وصَحَّحَهُ الألباني في صَحِيح الْجَامِع: ٧٨٤٧، وقال شُعيب الأرنؤوط: حسن لغيره.

(٢) أخرجه أحمد: ٥٨٦٩، والترمذي: ١٠٥، وهو حديث حسن صحيح. وقال ابن باز ﵀ هذا حديث صحيح، والمعنى والله أعلم أنهن مثيلات الرّجال إلاّ ما استثناه الشارع، كالإرث والشهادة وغيرهما مما جاءت به الأدلة، وقال شُعيب الأرنؤوط في تحقيقه لسنن الترمذي: حسن لغيره.

(٣) أخرجه أحمد: ٨٣٤٥، ومسلم: ١٤٦.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ پیاوێکی بڕوادار هیچ ئافرەتێکی بڕوادار نەبوغزێنێ، ئەگەر ڕقی لە سیفەتێکی خراپی بوو، ئەوە سیفەتێکی دیکەی باشی هەیە کە لێی ڕازییە.

## ژن و مێرد دەبێ سەیری خوارووی خۆیان بکەن لە بواری دونیاداری

٩٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، وَانْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلُ مِنْكُمْ، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ لَا تَزْدُوا نِعْمَةَ الله»[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەیری ئەو کەسە مەکەن کە لە سەرووی ئێوەوەیە، (بەڵکو) سەیری ئەو کەسە بکەن لە خوارووی خۆتانەوەیە، چونکە ئەوە نزیکترە کە نیعمەتی خوا ڕەتنەکەنەوە (دڵنیایی زیاترت پێدەدات و قەناعەتت بۆ دروست دەکات).

## بە ئەندازەی پێویست گرنگیدان بە ژیانی دونیا

٩٣٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خُطْبَةً مَا سَمِعْتُ مِثْلَهَا قَطُّ، وَقَالَ: «لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»، فَغَطَّى أَصْحَابُهُ وُجُوهَهُمْ لَهُمْ حَنِينٌ[2].

ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکیدا، هەرگیز گوێم لە وتاری وا نەبووە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەیدا فەرمووی: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن، کەم پێدەکەنن و زۆر دەگریێن، هاوەڵانی ڕوخساری خۆیان داپۆشی (شتێکیان بەسەر سەری خۆیاندادا و سەریان نزم کردەوە)، هەنسکیان دەهات و بە کوڵ دەگریان.

---

(١) أخرجه أحمد: ٧٤٤٢، ومسلم: ٢٩٦٣، واللَّفظ لابن حبان: ٧١٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٤٣٤٥، ومسلم: ٤٢٦، والترمذي: ٢٣١٢، وابن حبان: ٥٧٩٢.

٩٣٧- عَنْ سَهْلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كَانَتْ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى كَافِراً مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ»[١].

سەهل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دونیا بە ئەندازەی باڵی مێشوولەیەک (نرخی) هەبووایە لە لای خوا، ئەوە یەک فڕە ئاوی بە کافرێک نەدەدا.

٩٣٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ وَتَشِبُّ فِيهِ اثْنَتَانِ: الْحِرْصُ عَلَى الْمَالِ، وَالْحِرْصُ عَلَى الْعُمُرِ»[٢].

ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئادەمیزاد پیر دەبێ و دوو شت بەهێزتر و گەنجتر دەبنەوە تیایدا: سووربوون لەسەر ماڵ و سامان، وە ئاوات خواستن لەسەر تەمەن درێژی و ژیان.

## خراپترین ژن و مێرد کامانەن؟

٩٣٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَشَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الرَّجُلُ يُفْضِي إِلَى امْرَأَتِهِ، وَتُفْضِي إِلَيهِ، ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا»[٣].

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خراپترین کەس لای خوا لە ڕۆژی دوایی پیاوێکە بۆ سەرجێی چۆتە لای ژنەکەی، وە ژنێکە بۆ سەرجێی چۆتە لای مێردەکەی، پاشان دێ بۆ خەڵکی باس دەکات و بڵاوی دەکاتەوە (کە ئاوا و ئاوای لەگەڵ هاوسەرەکەی کردوە).

---

(١) أخرجه الترمذي: ٢٣٢٠، والبيهقي في شعب الإيمان: ١٠٤٦٥، وصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٤٥٩، والترمذي: ٢٤٥٥، وابن ماجه: ٤٢٣٤، وابن حبان: ٣٢٢٩.

(٣) أخرجه مسلم: ١٤٣٧.

## ئەو ژنەی ڕێگرە لەسەرجێی کردن لەگەڵ مێردەکەی

٩٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَلَمْ تَأْتِهِ، فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا، لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ»[(١)].

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک بانگی ژنەکەی بکات بۆ سەرجێی کردن (جووتبوون)، ئەویش نەچێت بۆ لای (بێ پاساوێکی شەرعی)، مێردەکەشی ئەم شەوە بە دڵتەنگی و تووڕەییەوە بخەوێ، فریشتەکان نەفرین لەو ژنە دەکەن هەتا ڕۆژ دەبێتەوە.

## باشترین ئافرەت کامەیە؟

٩٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ النِّسَاءِ امْرَأَةٌ إِذَا نَظَرْتَ إِلَيْهَا سَرَّتْكَ، وَإِذَا أَمَرْتَهَا أَطَاعَتْكَ، وَإِذَا غِبْتَ- عَنْهَا حَفِظَتْكَ فِي نَفْسِهَا وَمَالِكَ»[(٢)].

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین ئافرەت ژنێکە ئەگەر سەیرت کرد دڵخۆشت بکات، کە فەرمانت پێکرد گوێڕایەڵیت بکات، وە ئەگەر لە لای نەبووی بتپارێزێ لە نەفسی خۆی وماڵەکەشت بپارێزێ (واتە: ئاگاداری حەیا و نامووسی خۆی بێت[(٣)]، وە زێدەڕۆیی نەکات لە ماڵ سەرف کردن).

## باشترین پیاو کامەیە؟

٩٤٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لأَهْلِي»[(٤)].

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٨٩٨، ومسلم: ١٤٣٦.

(٢) أخرجه الطيالسي: ٢٣٢٥، والديلمي: ٢٩١٢، والبزار: ٨٥٣٧ واللَّفظُ لَهُ- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أورد هذا الحديث ابن كثير في تفسيره برقم: ١٩٦٢، وقال محققه عبدالرزاق المهدي: حديث صحيح.

(٣) شتێک نەکات کە گوناهبار بێ و سومعە و ئابڕووی خۆی و مێردەکەی لەکەدار بکات.

(٤) أخرجه الترمذي: ٣٨٩٥ وقال: حسن صحيح.

عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترینتان باشترینتانه بۆ خانەوادە و خێزانەکەی، وە من لە هەمووتان باشترم بۆ خانەوادە و خێزانەکەم.

## کاتێک ژنێک ئازاری مێردەکەی دەدات

٩٤٣- عَنْ مُعَاذ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا إِلاَّ قَالَتْ زَوجَتُهُ مِنَ الحُورِ العِيْنِ: لاَ تُؤْذِيهِ قَاتَلَكِ اللَّهُ! فَإِنَّمَا هُوَ عِنْدَكِ دَخِيْلٌ، أَوْشَكَ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا»[1].

موعاز ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ژنێک مێردەکەی ئازار بدات، حەتمەن ئەو ژنە حۆرییەی کە لە بەهەشت بۆی دانراوە، (دوعای لێ دەکا و) دەڵێ: ئازاری مەدە ئەی خوا بتکوژێ! ئەوە تەنها لەلات میوان و سپاردەیە، زۆر نزیکە لێت جیابێتەوە و بێتەوە لای ئێمە.

## ئافرەتان بەرپرسیارن و ئەرکیشیان قورسە

٩٤٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ- عَنْ رَعِيَّتِهَا»[2].

ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژن بەرپرسیارە لە ماڵی مێردەکەی، وە بەرپرسیاریشە بەرانبەر ئەندامانی خێزان.

٩٤٥- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْد ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ، مِنَ النِّسَاءِ»[3].

---

(١) أخرجه الترمذي: ١٢٠٨، وقال: هذا حديث حسن غريب، وابن مَاجَه: ٢٠١٤، وحسنه شيعب الأرنؤوط عند الترمذي.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٤٠٩،

(٣) أخرجه البخاري: ٤٨٠٨، ومسلم: ٢٧٤٠،

ئوسامەی کوڕی زەید ﷄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێکم لە دوای خۆم جێنەهێشتووە لە بەڵا و ئاشووب بۆ پیاوان، خراپتر بێ لە ئافرەتان(ی خراپ، یانی: زۆرجار جوانی ئافرەت هۆکاری تاقیکردنەوەی پیاوە).

## باشترین نیعمەتی خوا ژنی ديندار و چاکە

**٩٤٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ»[1].

ئیبنو عومەر ﷄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی دونیا هەمووی چێژ و لەزەتە، چاکترینی چێژ و لەزەتەکانی دونیا ژنێکی چاکە.

## پێگە و پاداشتی کەسی ڕەوشت بەرز لای پێغەمبەر ﷺ

**٩٤٧-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ- عَنْ أَبِيهِ- عَنْ جَدِّهِ ﷄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَحَبِّكُمْ إِلَيَّ، وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِساً يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟» فَسَكَتَ الْقَوْمُ، فَأَعَادَهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، قَالَ الْقَوْمُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «أَحْسَنُكُمْ خُلُقاً»[2].

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی لە باپیری ﷄ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خۆشەویستترینتان لە لای من و نیزیکترینتان لە مەجلیسی من لە ڕۆژی قیامەت؟ خەڵکەکەش بێدەنگ بوون، دووجار یان سێجار فەرموویەوە، خەڵکەکە گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: ڕەوشت جوانترینتان.

---

(١) أخرجه مسلم: ٣٦٣٤.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٢٧٢، وحَسَّنَهُ محققه في السلسلة الصحيحة: (٧٩٦).

## دادپەروەری کردن لە بەخشین لە نێوان منداڵەکان

٩٤٨- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: تَصَدَّقَ عَلَيَّ أَبِي بِبَعْضِ مَالِهِ، فَقَالَتْ أُمِّي عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لاَ أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَانْطَلَقَ أَبِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِيُشْهِدَ عَلَى صَدَقَتِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: اتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا فِي أَوْلاَدِكُمْ، فَرَجَعَ أَبِي، فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ»[1].

نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: باوکم هەندێک لەماڵەکەی بە دیاری پێدام، دایکیشم کە عەمرەی کچی ڕەواحەیە، گوتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ شایەد نەبێ لەسەری، بابیشم چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی شایەد بێ لەسەر ئەو ماڵەی بە منی داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو کارەت بۆ هەموو منداڵەکانت کردوە؟ گوتی: نەخێر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پارێز لە خوا بکەن لە نێوان منداڵەکانتان دادگەربن، دوای ئەوە باوکم گەڕایەوە و دیارییەکەی لێوەرگرتمەوە.

## خەرجی ژن لەسەر پیاوە

٩٤٩- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ يَحْتَسِبُهَا فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ»[2].

ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو خەرجی ماڵ و منداڵەکەی کرد و چاوەڕوانی پاداشت بوو، ئەوە بۆی بەخێر دەنووسرێ.

٩٥٠- عَنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ- عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَعْطَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فَهُوَ صَدَقَةٌ»[3].

---

(١) متفق عليه، واللَّفْظُ لِمسلم: ١٦٢٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٥.

(٣) أخرجه أحمد: ١٧٦٥٤، قال شُعيب الأرنؤوط: صحيح.

عەمرى كوڕى ئومەییە لە باوكى ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر شتێک کە پیاو بە هاوسەرەکەی دەدات خێری بۆ دەنووسرێ.

٩٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ، وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ، أَعْظَمُهَا أَجْرًا الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموویەتی: دینارێک خەرجی دەکەی لە پێناوی خوا، وە دینارێک خەرجی دەکەی بۆ ئازاد کردنی کۆیلەیەک، وە دینارێک کە دەیکەیتە خێر و دەیبەخشی بە نەدارێک، وە دینارێک خەرجی دەکەی بۆ خێزانەکەت، (لە نێو ئەوانەدا) ئەوەی کە بۆ خێزانەکەت خەرجکردوە، پاداشتی لە هەموویان گەورەترە.

## ژن لە سێ ڕۆژ زیاتر پرسە ناگێڕێ بۆ جگە لە مردنی مێردەکەی

٩٥٢- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ وَزَيْنَب بِنْتِ جَحْشٍ ﷺ قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تَحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ، أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[٢].

ئوممو حیبیبە و زەینەبی کچی جەحش ﷺ دەڵێن: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموویەتی: دروست نییە بۆ ژنێک کە بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێ لە سێ ڕۆژ زیاتر پرسە دابنێ بۆ مردوو، مەگەر مردووەکە هاوسەری خۆی بێ، ئەوکاتە پێویستە چوار مانگ و دە ڕۆژ پرسەی بۆ دابنێ.

---

(١) أخرجه مسلم: ٩٩٥.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٠٢٤، ومسلم: ١٤٨٦.

## هەندێ لە یاسا و ڕێساکانی تەڵاق و خولع

**٩٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتَغَيَّظَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: «لِيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ فَتَطْهُرَ، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا فَلْيُطَلِّقْهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ، كَمَا أَمَرَ اللَّهُ ﷻ»[1].**

ئیبنو عومەر ﷺ هاوسەرەکەی تەڵاقدا، لەو کاتەدا لە سووڕی مانگانەدا بوو، عومەر ﷺ ئەوەی باسکرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی تووڕە بوو، دوایی فەرمووی: با بیگێڕێتەوە و لای خۆی بیهێڵێتەوە تاکو پاک دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە حەیزەوە و پاک دەبێتەوە، ئنجا ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات با تەڵاقی بدات، پێش ئەوەی لەگەڵی جووت بێ، ئەو عیددەیە کە خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە.

**٩٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً رَمَى امْرَأَتَهُ، وَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَتَلاعَنَا، كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى، ثُمَّ قَضَى بِالْوَلَدِ لِلْمَرْأَةِ، وَفَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاعِنَيْنِ[2].**

ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێک ژنەکەی تۆمەتبار کرد، گوتی: ئەو منداڵە لە من نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن نەفرینیان لە یەکتر کرد، وەک خوای بەرز فەرموویەتی، پاشان فەرمانی کرد منداڵەکە بۆ ژنەکە بێ، وە ژن و مێردەکەی لە یەکتر جیاکردەوە.

**٩٥٥- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلَاقاً مِنْ غَيْرِ بَأْسٍ، فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الجَنَّةِ»[3].**

---

(١) أخرجه البُخَاري: ٤٩٠٨.

(٢) أخرجه البُخَاري: ٤٤٧١.

(٣) أخرجه أحمد: ٢٢٣٧١، ٢٢٤٤٠، وصَحَّحَهُ شُعيب الأرنؤوط، وأبو داود: ٢٢٢٦، والترمذي: ١١٨٧، وابن ماجه: ٢٠٥٥.

سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژنێک بە ناهەق و بەبێ پاساو و بەڵگە داوا بکات لە مێردەکەی جیابێتەوە، ئەوە بۆنی بەهەشتی لێ قەدەغەیە.

٩٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ أَمَا إِنِّي مَا أَعِيبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلاَ دِينٍ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الإِسْلاَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إقْبَلِ الحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً»[1].

ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: خێزانی سابیتی کوڕی قەیس هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نە لە ڕووی ڕەوشتەوە و نە لەڕووی دینەوە ڕەخنەم لە سابیتی کوڕی قەیسی (مێردم) نییە، بەڵام پێم ناخۆشە لە ئیسلامەتیدا تووشی کوفر ببم (واتە: دوای ئەوەی کە مسوڵمان بووم و هاتوومەتە نێو ئیسلام، توشی گوناح ببم، دەمەوێ لێی جیاببمەوە)! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئامادەی باخەکەی بدەیەوە (کە مارەیی بوو)، ئەویش دەڵێ: بەڵێ، پێغەمبەری خواش ﷺ (بانگی سابیتی کوڕی قەیسی کرد) فەرمووی: باخەکەی لێوەربگرەوە و تەڵاقی بدە و دەستی لێ هەڵبگرە.

## لەشگرانیی و سووڕی مانگانەو خوێنی نەخۆشی ئافرەتان

٩٥٧- عَنْ مُعَاذَةَ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتَ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلاَةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ، قَدْ كُنَّا نَحِيضُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَا نَقْضِي، وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءٍ[2].

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٩٧١، والنسائي: ٣٤٦٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٣١٥، ومسلم: ٧٨٩، وغيرهما.

موعازە دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک پرسیاری کرد لە عائیشە ﵂، ئایا ئافرەتی حەیزدار نوێژەکانی دەگێڕێتەوە؟ گوتی: ئایا تۆ حەروریەیت؟ (حەروری کۆمەڵێک بوون لە خەواریجەکان، ئاینیان زۆر بە توندی وەرگرتبوو)، ئێمە لەلای پێغەمبەر ﷺ دەکەوتینە سووڕی مانگانەو نە نوێژمان دەگێڕایەوەوە، نە فەرمانمان پێ دەکرا بە گێڕانەوەی.

٩٥٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ أَنَّ امْرَأَةً ﵂ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اغْتَسَلَتْ مِنْ جَنَابَةٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ، يَتَوَضَّأُ مِنْ فَضْلِهَا، فَقَالَتْ لَهُ، فَقَالَ: «إِنَّ الْمَاءَ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ»(١).

ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک ﵂ لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە لەشگرانی خۆی شۆردبوو، پێغەمبەریش ﷺ هات دەستنوێژی شۆرد بە پاشماوەی ئاوەکەی، خێزانەکەی پێی گوت (کە ئەم ئاوە پاشماوەیە ئەوە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی ئاو پاکە هیچ شتێک پیسی ناکات.

٩٥٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنْتُ أَضَعُ الْإِنَاءَ عَلَى فِي وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ، وَآخُذُ الْعَرْقَ وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ»(٢).

عائیشە ﵂ دەڵێ: من قاپم دەخستە سەر دەمم لە سووڕی مانگانەشم بووم (ئاوم دەخواردەوە)، پاشان دەمدا بە پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەمی دەخستە شوێن دەمم (ئاوی لێ دەخواردەوە)، گۆشتی نەرمم لەسەر ئێسک دەکڕاندەوە، پاشان دەمدایە دەستی، ئەویش دەمی دەخستە شوێنی دەمم (لێی دەخواردو دەیکڕاندەوە).

٩٦٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ ﵂: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لَا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِالْحَيْضَةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلَاةَ، فَإِذَا ذَهَبَ- عَنْكِ قَدْرُهَا فَاغْسِلِي- عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي»(٣).

---

(١) أخرجه النسائي: ٣٢٤، وابن خزيمة: ٩١، قال الأعظمي: إسناده صحيح.

(٢) أخرجه ابن حبان: ١٢٩٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٣) أخرجه البخاري: ٣٠٠، ومسلم: ٧٧٩.

عائیشه ﵂ دەڵێ: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش ﵂ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من پاک نابمەوە (لە حەیزو بەردەوام خوێن دەبینم) ئایا واز لە نوێژ کردن بێنم؟ (ڕاوی دەڵێ: عائیشه ﵂) گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەوە تەنها دەمارێکەو خوێنی حەیز نیە، ئەگەر کاتی حەیز هات واز لە نوێژ بێنە، ئەگەر کاتی تێپەڕی (واتە: ماوەی حەیز) خۆت بشۆرەو خۆت لە خوێنەکە پاک بکەوەو، نوێژ ئەنجام بدە.

**٩٦١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَاوِلِينِي الْخُمْرَةَ مِنَ الْمَسْجِدِ»، قُلْتُ: إِنِّي حَائِضٌ، قَالَ: «إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَتْ فِي يَدِكِ»[(١)].**

عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: بەرماڵی نوێژم بۆ بێنە لە مزگەوت، گوتم: من لە حەیزدام، فەرمووی: بێگومان حەیزەکەت لە دەستتدا نیە.

**٩٦٢- عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَيَّ، وَأَنَا حَائِضٌ[(٢)].**

دایکی ئیمانداران عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی دەخوێند پاڵی دابوو بە منەوە، منیش لە سووڕی مانگانەش دابووم.

**٩٦٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ»[(٣)].**

عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا نوێژی کچی پێگەیشتوو وەرناگرێ هەتا خۆی دانەپۆشێ (نابێ هیچ شوێنێکی بە دەرەوە بێ، جگە لە دەست و ڕووخسار).

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٩٨، وابن حبان: ١٣٥٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٢) أخرجه ابن حبان: ١٣٦٦، شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرطهما.

(٣) أخرجه أحمد: ٢٥٨٧٦، أبو داود: ٦٤١، والترمذي: ٣٧٧، وَحَسَّنَهُ، وابن ماجه: ٦٥٥، والحاكم: ٩١٧، وقال: صحيح على شرط مسلم، وابن حبان: ١٧١١.

## نابێ ئافرەت و پیاوی نامەحرەم
## بە تەنیا لە شوێنێکی چۆڵ پێکەوەبن

٩٦٤- عَنْ عُمَر بْن الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ، فَإِنَّ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ، أَلاَ وَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ تَسُوؤُهُ سَيِّئَتُهُ، وَتَسُرُّهُ حَسَنَتُهُ فَهُوَ مُؤْمِنٌ»[١].

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگاداربن با پیاو لەگەڵ ئافرەتێکی (نامەحەڕەم)ـدا بە تەنها پێکەوە نەبن، چونکە سێیەم کەسیان شەیتانە، ئاگاداربن هەر یەکێک لە ئێوە گوناهەکانی دڵتەنگی بکەن و چاکەکانی دڵخۆشی بکەن، ئەوە بڕوادارە.

## پیاوی لەشگران و ئافرەتی حەیزدار پیس نین

٩٦٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، كِلاَنَا جُنُبٌ، وَكَانَ يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ، فَيُبَاشِرُنِي وَأَنَا حَائِضٌ، وَكَانَ يُخْرِجُ رَأْسَهُ إِلَيَّ، وَهُوَ مُعْتَكِفٌ، فَأَغْسِلُهُ وَأَنَا حَائِضٌ[٢].

عائیشە ﷺ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆمان دەشۆرد لە یەک تەشتدا، هەردووکیشمان لەشگران بووین، فەرمانی پێدەکردم نێوان ناوک و ئەژنۆم داپۆشم، ئنجا نزیکم دەکەوتەوە و دەستی بەرم دەکەوت، لە کاتێکدا من لە سووڕی مانگانەشدا بووم، هەروەها کاتێک ئیعتیکافی دەکرد (لە مزگەوت) سەری دەهێنایە ژوورەوە بۆ لام[٣]، منیش (قژیم) دەشۆرد، لە کاتێکدا لە سووڕی مانگانەدا بووم.

---

(١) أخرجه مسلم: ٥٥٨٦. قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرطهما.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٩٥.

(٣) ژووری دایکمان عائیشە ﷺ بە مزگەوتەوە بووە.

## پاداشتی گوێڕایەڵی ئافرەت بۆ مێردەکەی

٩٦٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّتِ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا: ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ»[١].

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ژن پێنج نوێژە فەڕزەکانی کرد، ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو بوو، داوێنی خۆشی لە حەڕام پاراست، گوێڕایەڵی مێردەکەشی کرد (لە شتی باش)، ئەوە (ڕۆژی دوایی) پێی دەگوترێ: بڕۆ بەهەشتەوە لە کام دەرگای بەهەشت پێت خۆشە.

٩٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ، وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ»[٢].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ ژن دروست نییە ڕۆژووی سوننەت بگرێ، لە کاتێکدا کە مێردەکەی لە ماڵ بێت، مەگەر مێردەکەی مۆڵەتی پێ بدات.

## ئەنجامدانی حەج گەورەترین جیهادی ئافرەتانە

٩٦٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللَّهِ ﷺ أَلاَ نَغْزُو وَنُجَاهِدُ مَعَكُمْ؟ فَقَالَ: «لَكِنَّ أَحْسَنُ الْجِهَادِ وَأَجْمَلُهُ، الْحَجُّ حَجٌّ مَبْرُورٌ»، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَلاَ أَدَعُ الْحَجَّ بَعدَ إِذْ سَمِعْتُ هَذَا مِنْ رَسُوْلِ اللَّهِ ﷺ[٣].

---

(١) أخرجه أحمد: ١٦٦١، وإبن حبان: ٤١٦٣، وَصَحَّحَهُ شُعيب الأرنؤوط.

(٢) أخرجه البخاري: ٥١٩٥، ومسلم: ١٠٢٦.

(٣) أخرجه البخاري: ١٧٦٢.

عائیشه ﵂ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لەگەڵ ئێوە غەزا و جیهاد نەکەین؟ فەرمووی: بۆ ئێوە باشترین و جوانترین جیهاد ئەنجامدانی حەجکردنە، حەجێکی قبوڵکراو، عائیشه ﵂ فەرمووی: ئیتر وازم لە حەجکردن نەهێنا دوای ئەوەی ئەوەم بیست لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

## ڕێگەدان بە چوونی ئافرەت بۆ نوێژی کۆمەڵ

٩٦٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ أَنْ يُصَلِّينَ فِي الْمَسْجِدِ»، فَقَالَ ابْنٌ لَهُ: إِنَّا لَنَمْنَعُهُنَّ، فَقَالَ: فَغَضِبَ غَضَباً شَدِيداً، وَقَالَ: أُحَدِّثُكَ- عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَتَقُولُ: إِنَّا لَنَمْنَعُهُنَّ؟[١].

لە ئیبنو عومەر ﵄ دەگێرنەوە، کە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕێ لە ئافرەتان مەگرن کە بیانەوێ نوێژ بکەن لە مزگەوت، یەکێک لە کوڕەکانی ئەو (لەوێ بوو) گوتی: ئێمە ڕێیان لێ دەگرین، ئیبنو عومەر ﵄ زۆر تووڕە بوو (کە گوێبیستی بوو)، گوتی: من فەرموودەی پێغەمبەرت ﷺ بۆ دەگێڕمەوە، کەچی تۆ دەڵێی: ئێمە ڕێگایان پێ نادەین؟!

٩٧٠- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂، قَالَتْ: كُنَّا نُؤْمَرُ أَنْ نَخْرُجَ يَوْمَ الْعِيدِ، حَتَّى نُخْرِجَ البِكْرَ مِنْ خِدْرِهَا، حَتَّى تَخْرُجَ الْحُيَّضُ، فَيُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ وَيَدْعُونَ بِدُعَائِهِمْ، يَرْجُونَ بَرَكَةَ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَطُهْرَتَهُ[٢].

ئوممو عەطییە ﵂ دەڵێ: ئێمە فەرمانمان پێدەکرا لە ڕۆژی جەژندا دەربچین، تەنانەت کچانیش لەگەڵ خۆمان ببەین، هەروەها ئەو ئافرەتانەش کە لە سووڕی مانگانەدا بوون، لە دوای خەڵکەوە ڕێک بوەستن و بە تەکبیری ئەوان تەکبیر بکەن، بە پاڕانەوەی ئەوانیش بپاڕێنەوە، ئومێدی پێز و بەرەکەت و پاکی ئەو ڕۆژە بکەن.

---

(١) أخرجه مسلم: ٤٤٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٩٧١.

## تێپەڕبوونی ئافرەت بە پێش نوێژخوێن نوێژەکەی نابڕێ

٩٧١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرِجْلَايَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا، وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ[1].

عائیشه ﵂ دەڵێ: من دەخەوتم لە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ، قاچەکانم لەو شوێنە بوو کە قیبلەی ئەو بوو (بۆ نوێژکردن)، کاتێک سوجدەی ببردبایە لە قاچمی دەدا (وەک ئاگادارکردنەوە)، منیش قاچم دەکێشایەوە، ئەگەر هەڵسابا درێژم دەکردەوە، ماڵەکان ئەو کات چرایان تێدا نەبوو.

## سپڵەیی ژن بەرانبەر مێردەکەی و بە پێچەوانەشەوە

٩٧٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَى امْرَأَةٍ لَا تَشْكُرُ لِزَوْجِهَا، وَهِيَ لَا تَسْتَغْنِي- عَنْهُ»[2].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا سەیری ئەو ژنە ناکات کە سوپاسگوزاری مێردەکەی ناکات، لە کاتێکدا بێ پێویست نابێ لە مێردەکەی و هەمیشە ئیشی بە مێردەکەیەتی، بەڵام سوپاسیشی ناکات.

٩٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُرِيتُ النَّارَ، فَإِذَا أَكْثَرُ أَهْلِهَا النِّسَاءُ يَكْفُرْنَ، قِيلَ أَيَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الْإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ، ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئاً، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْراً قَطُّ»[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٨٢.

(٢) أخرجه النسائي في الكبرى: ٩١٣٥، والحاكم: ٢٧٧١، وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ١٩٤٤، رواه النسائي والبزار بإسنادين رواة أحدهما رواة الصحيح، والحاكم وقال صحيح الإسناد.

(٣) أخرجه البخاري: ١٠٠٤، ومسلم: ٩٠٧.

ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاگری دۆزەخم پێشاندرا، زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتانی سپڵە بوون، گوترا: ئایا سپڵەیی دەنوێنن بەرانبەر بە خوا؟ فەرمووی: سپڵەیی دەکەن بەرانبەر مێردەکانیان، وە نکوڵی چاکەکان دەکەن، ئەگەر تۆ بە درێژایی تەمەن چاکە لەگەڵ یەکێکیان بکەیت، پاشان شتێکی (ناپەسندت) لێ ببینێ، دەڵێ: هەرگیز خێر و چاکەم لە تۆ نەبینیوە!!

## چاوپیسی و چارەسەرەکەی

**٩٧٤- عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعَيْنُ حَقٌّ»[١].**

عامڕی کوڕی ڕەبیعە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاوپیسی (کە سەرچاوەکەی حەسوودییە) هەقە و کاریگەری هەیە، (چارەسەرەکەی بریتیە لە ڕوقیەی شەرعی).

## بە سووک سەیر کردنی مسوڵمان

**٩٧٥- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَرْبَى الرِّبَا الاِسْتِطَالَةُ فِي عِرْضِ الْمُسْلِمِ بِغَيْرِ حَقٍّ»[٢].**

سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خراپترین جۆری ڕیبا و سووخۆریی (کە گوناهی گەورەیە) بریتیە لە: زێدەڕۆیی کردن لە قسەی ناشیرین گوتن و بە سووک سەیرکردن و باسکردنی نامووسی مسوڵمان بە ناهەق.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٤٠٨.

(٢) أخرجه أَبُو دَاوُد: ٤٨٧٨، وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ٢٥٣٢.

## توانج و پلاردان له خەڵک

٩٧٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قُلْتُ: يَا رَسُول اللَّهِ ﷺ إِنَّ صَفِيَّةَ امْرَأَةٌ وَقَالَتْ بِيَدِهَا هَكَذَا كَأَنَّهَا، تَعْنِي قَصِيرَةً، فَقَالَ: «لَقَدْ مَزَجْتِ بِكَلِمَةٍ لَوْ مَزَجْتِ بِهَا مَاءَ الْبَحْرِ لَمُزِجَ»[١].

عائیشه ﵂ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییە ئافرەتێکە «بەدەست ئاماژەی کرد» کورتە باڵایە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی وشەیەکت تێکەڵی قسەکانت کرد، ئەگەر تێکەڵی ئاوی دەریای بکەی، ئاوەکە دەگۆڕێ و بۆگەنی دەکات!

٩٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُبْصِرُ أَحَدُكُمُ الْقَذَاةَ فِي عَيْنِ أَخِيهِ، وَيَنْسَى الْجِذْعَ فِي عَيْنِهِ»[٢].

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێک لە ئێوە پوشکە لە چاوی برا (و خوشکە)کەی دەبینێ، (واتە: عەیبی زۆر بچووکی ئەوان دەبینێ)، بەڵام کاریتە لە نێو چاوی خۆی نابینێ، (واتە: کەچی گوناهی گەورەی خۆی نابینێ)!

## گێڕانەوەی هەرچی دەیبیستی

٩٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيَّ ﷺ: «كَفَى بِالْمَرءِ إِثْماً أَنْ يُحَدِّثَ بَكُلِّ مَا سَمِعْ»[٣].

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ کە پێی گوناهبار ببێ، کە هەرچی بیستوویەتی بیگێڕێتەوە.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٥٦٠١، عَن أبي حذيفة وكان من أصحاب عبد الله وكان طلحة يحدث عنه عن عائشة ﵃ أجمعين، تعليق شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، والترمذي: ٢٥٠٢، واللفظ له.

(٢) أخرجه ابن حبان: ٥٧٦١، وقال شُعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ٢٣٣١.

(٣) ) أخرجه ابن حبان: ٣٠، قال شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الصحيح.

## پرسیارکردن لە شتێک کە پەیوەندی بە تۆوە نییە

٩٧٩- عَنِ الحُسَيْنِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيِّ ﷺ: «مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ»[١].

حوسەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە جوانی و چاکی مسوڵمانییەتی مرۆڤ ئەوەیە کە وازبێنێ لە شتێک کە پەیوەندی بە ئەوەوە نییە.

## گومانی خراپ بردن

٩٨٠- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ»[٢].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داواتان لێدەکەم (خۆتان دوور بگرن) لە گومانی خراپ بردن (بە خەڵک)، لەبەر ئەوەی گومانی خراپ گەورەترین درۆیە.

## قسەی خراپ هێنان و بردن

٩٨١- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَدْرُونَ مَا الْعِضَةُ؟»، قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «نَقْلُ الْحَدِيثِ مِنْ بَعْضِ النَّاسِ إِلَى بَعْضٍ، لِيُفْسِدُوا بَيْنَهُمْ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا دەزانن (العِضَة) چییە؟ گوتیان: خوا و پێغەمبەر زاناترن، فەرمووی: گواستنەوەی قسەیە لەلایەن کۆمەڵە خەڵکێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە، بە مەبەستی نێوان تێکدان و ئاشووب دروستکردن.

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧٣٧، قال شُعيب الأرنؤوط: حسن بشواهده.

(٢) أخرجه البخاري: ٥١٤٣، ومسلم: ٢٥٦٣.

(٣) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٤٢٥،- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، وروى الإمام مسلم في صحيحه بهذا اللفظ:- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ إِنَّ مُحَمَّداً ﷺ، قَالَ: أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ مَا الْعَضْهُ؟ هِيَ النَّمِيمَةُ الْقَالَةُ بَيْنَ النَّاسِ، وإِنَّ مُحَمَّدًا ﷺ، قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ يَصْدُقُ حَتَّى يُكْتَبَ صِدِّيقًا، ويَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ كَذَّابًا صحيح مسلم: ٢٦٠٦.

٩٨٢- عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّكَ إِنْ اتَّبَعْتَ عَوْرَاتِ النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ أَوْ كِدْتَ أَنْ تُفْسِدَهُمْ»[1].

موعاویه ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ ئەگەر بە دوای کەم و کوڕییەکانی خەڵکدا بگەڕێی (لە نێو خەڵکدا باسیان بکەی)، ئەوە تێکیان دەدەی، یان خەریکە تێکیان بدەیت.

٩٨٣- عَنْ حُذَيْفَة ﷺ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ»[2].

حوزەیفە ﷺ، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (هەرگیز لە سەرەتاوە) ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی قسە دێنێ و دەبات لە نێوان خەڵکدا (بۆ ئەوەی کێشەو ئاشووب بنێتەوە).

**تێبینی:** سیفەتی (قتات) لەبەر گەورەیی تاوانەکەی، خوای دادگەر ئەم سزایە سەختەی بۆ خاوەنەکەی داناوە، چونکە ئەم سیفەتە ئەو واتایانە دەگرێتە خۆی:

١- ڕەنگە ئەو کەسە بچێ لە پشت دەرگا گوێ لەو قسانە بگرێت و بە خراپترین شێوە بیگێڕێتەوە.

٢- یان بە ئامرازێک، قسەکان تۆمار بکات و بیگوازێتەوەو بیگۆڕێ.

٣- یاخود نامەی مۆبایل، یان هەر ئامێرێکی دیکە دەدزێ و، بۆ مەبەستی ئاشووب بە کاری دێنێ.

بە داخەوە، ئەوانە ئێستا لە هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی زۆر زۆر بوون.

---

(١) أخرجه أَبُو داود: ٤٨٨٨، وصَحَّحَهُ كل من الألباني شُعيب الأرنؤوط.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٧٠٩، مسلم: ١٠٥.

## به نهێنی و چپە قسەکردن

٩٨٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الْآخَرِ حَتَّى يَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، مِنْ أَجْلِ أَنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ»[1].

عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەگەر سێ کەس بوون) با دووانتان بەبێ کەسی سێیەم بە چپە و نهێنی قسە نەکەن، هەتا تێکەڵاوی خەڵک دەبن، چونکە ئەو کارە (کەسی سێیەم) دڵتەنگ دەکات.

## کەشخەیی و فیزکردن

٩٨٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَعَظَّمَ فِي نَفْسِهِ، أَوِ اخْتَالَ فِي مِشْيَتِهِ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ»[2].

ئیبنو عومەر ﷺ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس لە دڵی خۆیدا خۆی پێ گەورە بێ، لە ڕۆیشتندا کەشخەیی و فیز بکات، کاتێ دەگاتەوە بە خوا، خوا لێی تووڕەیە.

## دواخستنی نوێژ و بێ ئاگایی لە گەورەیی نوێژ

٩٨٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِصَلَاةِ الْمُنَافِقِينَ يَدَعُ الْعَصْرَ حَتَّى إِذَا كَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ قَامَ فَنَقَرَ كَنَقَرَاتِ الدِّيكِ، لَا يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهِنَّ إِلاَّ قَلِيْلاً»[3].

١

---

(١) أخرجه مسلم: ٣٧.

(٢) أخرجه أحمد: ٥٩٩٥، تعليق شُعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الصحيح.

(٣) أخرجه أحمد: ١٢٠١٨، ومسلم: ١٤٤٣، وابن حبان: ٢٦٠، واللَّفْظُ لَهُ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا ئاگادارتان بکەمەوە بە نوێژی دووڕووەکان، (مونافیق) نوێژ ناکات هەتا خۆر دەکەوێتە نێوان هەردوو شاخی شەیتان (واتە: خەریکە خۆرئاوا ببێ)، ئنجا هەڵدەستێ چەند دەنوکێک (لە زەوی) دەدات، وەکو دەنوکی کەڵەشێر، زۆر بە کەمی نەبێ یادی خوای تێدا ناکات.

٩٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ- عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ بِصَلَاتِهِ، فَإِنْ صَلَحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ»[١].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی یەکەم کردەوە کە بەندە لەسەری لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ لە ڕۆژی دوایی نوێژەکانیەتی، ئەگەر نوێژەکانی باش بوون ئەوە سەرفراز بووەو سەرکەوتوو بووە، بەڵام ئەگەر نوێژەکانی خراپ بوون، (واتە: بە تەواوی ئەنجامی نەدابن) ئەوە خەسارەتمەندو زەرەرمەند بووە.

٩٨٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَسِيَ صَلاَةً، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذلِكَ»[٢].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژی لە بیرچوو بیکات، ئەوە هەرکات بیری هاتەوە با نوێژەکەی بکات، چونکە ئەمە هیچ کەفارەتێکی بۆ نییە، جگە لە ئەنجامدانی نوێژەکە.

فەرمووده هاتوون دەربارەی ئەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سوجدەی سەهوی بردوە پێش سەلام دانەوەو دوای سەلام دانەوەش، بۆیە هەردووکیان دروستن، لەبەر ئەوەشە پێشەوا نەوەوەی لە (المجموع)ـدا دەیهێنێ لە ماوەردی شافیعی خاوەنی کتێبی (الحاوي) دەڵێ: ڕاجیایی نییە لە نێوان زایانی شەرعزان، واتە: هەموو

---

(١) أخرجه أحمد: ٩٤٩٠، أخرجه الترمذي: ٤١٣، وقال: حسن غريب، والنسائي: ٤٦٥، وابن ماجه: ١٤٢٥، وصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٩٧.

زانایان لەسەر ئەوەی سوجدەی سەهو دروستە پێش یان دوای سەلام دانەوە، بەڵکو ڕاجیان لەسەر سوننەت بوونی.. لەوبارەوە ئەم دەقە دێنین:

٩٨٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ، فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى أَثَلَاثَاً أَوْ أَرْبَعَاً؟ فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْسَاً شَفَعْنَ لَهُ صَلَاتَهُ، وَإِنْ كَانَ صَلَّى تَمَامَاً كَانَتَا تَرْغِيمَاً لِلشَّيْطَانِ»[1].

ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە کەوتە گومانەوە لە ناو نوێژەکەی نەیزانی سێ یان چوار (ڕکاتی) کردوە، با گومان وەلا بنێت و بونیاد لەسەر دڵنیایی بنێت، پاشان دوو سوجدە دەبات پێش سەلام دانەوە، جا ئەگەر پێنج ڕکاتی کردبوو، ئەو دوو سوجدەیە جێگای ڕکاتێکی بۆ دەگرنەوەو نوێژەکەی دەکەن بە جووت، وە ئەگەر چوار ڕکاتی کردبوو ئەوە ئەو دوو سوجدەیە دەبێتە مایەی گەڕانەوەی شەیتان بە زەبوونی.

٩٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحْدَى صَلَاتَيِ الْعَشِيِّ، «إمَّا الظّهر وإمَّا العَصْر» فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَتَى جِذْعَاً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَاسْتَنَدَ إِلَيْهَا، وَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ، فَقَامَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقُصِرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ فَنَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ يَمِينًا وَشِمَالاً، فَقَالَ: «مَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ»؟ قَالُوا صَدَقَ لَمْ تُصَلِّ إِلاَّ رَكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَسَلَّمَ ثُمَّ كَبَّرَ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَفَعَ، ثُمَّ كَبَّرَ، وَسَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَرَفَعَ[2].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێک لە نوێژەکانی (دانی ئێوارەی کرد، یان نیوەڕۆ بوو، یان عەصر، لە دوو ڕکات سەلامی دایەوە، چوو بۆ لای دارێک کە لە ڕووگەی مزگەوت بوو، دەستی پێیەوە گرت، بە پەلە لە ناو خەڵکی دەرچوو، (ذُو الْيَدَيْن)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە، یان لە بیرت چوو؟ پێغەمبەر ﷺ، تەماشای لای ڕاست و چەپی کرد، فەرمووی:

---

(١) أخرجه مسلم: ٥٧١.

(٢) أخرجه البخاري: ٤٦٨، ومسلم: ١٣١٦.

(ئەوەی خاوەن دوو دەستەکە چی دەڵێ؟) وتیان: بەڵێ، ڕاست دەکات، تەنها دوو ڕکات نوێژت کرد، بۆیە دوو ڕکات نوێژی تری کرد، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان تەکبیری کرد و سوجدەی برد، پاشان تەکبیری کردو سەری بەرز کردەوە، پاشان تەکبیری کرد پاشان سوجدەی برد، پاشان تەکبیری کردو سەری بەرز کردەوە.

## پچڕاندنی پەیوەندی و قسە نەکردن لەگەڵ یەکتر

**٩٩١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَعْمَالَ بَنِي آدَمَ تُعْرَضُ كُلَّ خَمِيسٍ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، فَلاَ يُقْبَلُ عَمَلُ قَاطِعِ رَحِمٍ»[١].

ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە دڵنیایی کردەوە (چاکە)کانی ئادەمیزاد بەرزدەکرێنەوەو ڕادەنوێنرێن (بۆ خوای پەروەردگار) هەموو پێنج شەممەیەک لە شەوی هەینیدا، جا کردەوەی ئەوانە وەرناگیرێ کە پەیوەندی خزمایەتیان پچڕاندوە.

**٩٩٢-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجَّلَ لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ مَعَ مَا يُدَّخَرُ لَهُ مِنَ البَغِي، وَقَطِيعَةُ الرَّحِمِ»[٢].

ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ گوناهێک نییە کە هێندە بە پەلە خاوەنەکەی پەلکێش بکات بۆ سزای خوا (هەر لە دونیا)، سەرباری ئەوەش کە بۆی هەڵدەگیرێ لە دواڕۆژ، ئەوانیش ستەم و دەست درێژی، وە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی (ئەو دوو گوناهە زۆر بە پەلە خاوەنەکەیان تووشی سزا دەبن).

---

(١) أخرجه أحمد: ١٠٢٧٧، تعليق شُعيب الأرنؤوط: إسْنَاده حَسَن.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٢٩، وصَحَّحَهُ محققه في السلسلة الصحيحة: ٩١٨، ٩٧٨.

